

13

# قاچاغی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان و یاسای نێونەتەوەیی


عەلی مورتەزەوی

و: ب. عەلی

نوسینی: عەلی مورتەزەوی

# قاچاغی نێونەتەوەیی مادده
# هۆشبەرەکان و یاسای نێونەتەوەیی

وەرگێڕانی: ب. مانی



هەولێر 2007

**ناوی کتێب: [illegible]**

نووسینی: عەلی مورتەزەوی

وەرگێڕانی: ب. مانی

نەخشەسازی ناوەوە: هەردی

بەرگ: ئاسۆ مامزادە

ژمارەی سپاردن: ( 1372 )

تیراژ: ( 750 ) دانە

چاپی یەکەم 2007

نرخ: ( 1000 ) دینار

چاپخانە: چاپخانەی خانی

زنجیرەی کتێب ( 23 )



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

www.mukiryani.com

asokareem@ maktoob.com

Tel: 2260311

# پێرست


پێرست........................................3
پێشەکی........................................7
دەلاقە........................................9
پێناسەکان........................................10
ماددەی هۆشبەر........................................10
گیرۆدەبوون (اعتیاد)........................................11
خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان........................................11
پۆلێنکردنی جۆرەکانی ماددە هۆشبەرەکان........................................12
- ماددە نەفیونییەکان........................................12
- ماددەی کانابس........................................12
- دەرمانە سەرخۆشکەرەکان........................................12
رەوتی مێژوویی ماددە هۆشبەرەکان........................................13
رەوشی گشتی بەرهەمهێنان و مەسرەفکردنی ماددە هۆشبەرەکان لە جیهاندا..14
دۆزینەوەی ماددە هۆشبەرەکان لە ئاستی نێو نەتەوەییدا........................................17
رەوشی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا........................................19
کورتە مێژووی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا:........................................19
رەوتی یاسادانان و خەبات لە دژی ماددە هۆشبەرەکان........................................21
ا- بەر لە شۆڕشی ئیسلامی........................................21
ب- دوای شۆڕشی ئیسلامی........................................24
رەوشی گیرۆدەبوون لە ولات........................................25

کۆنترۆڵی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان ........................ 29
دامەزراوە سەرەکییەکان ............................................. 29
1- کۆڕی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ..................... 29
2- لیژنەی نێونەتەوەیی کۆنترۆڵکردنی مادده هۆشبەرەکان (INCB) ... 30
3- بەرنامەی کۆنترۆڵی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان(UNDCP) .... 30
4- کۆمیسیۆنی مادده هۆشبەرەکان........................................ 30
5- شووڕای ئابووری و کۆمەڵایەتی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان: ... 31
ڕێکخراوە لاوەکییەکان ................................................ 31
1- ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (W.H.O) ............................ 31
2- ڕێکخراوی پۆلیسی تاوانی نێونەتەوەیی (ئینتەرپۆل) .............. 31
3- ڕێکخراوی گومرگی جیهانی (W.C.O) .............................. 32
4- کۆمیسیۆنی گواستنەوەی هەوایی نێونەتەوەیی (ANC) ............. 32
ڕێکخراوە لاوەکییەکانی دیکە .......................................... 32
کۆمەنگاوی جیهانی دژی مادده هۆشبەرەکان.............................. 33
گرووپە سیستماتییەکان و قاچاخی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان....... 39
دەسەڵاتی وڵاتان بۆ لێکۆڵینەوە لە تاوانە نێونەتەوەییەکان ............... 41
1- دەسەڵاتی خاک......................................................... 42
2- بنەمای دەسەڵاتی جیهانی .............................................. 42
3- بنەمای دەسەڵاتی جیهانی .............................................. 42
لایەنەکانی قەدەغەبوون و خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان.................. 43
دیاردەکانی دیکەی قەدەغەکردن و خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان..... 46
ترانزیتی مادده هۆشبەرەکان ............................................. 46
پێویستیی هاوکاری نێونەتەوەیی دژی قاچاخی مادده هۆشبەرەکان ......... 50
پەیماننامەکان و هاوکارییە نێونەتەوەییەکان لە دژی مادده هۆشبەرەکان.. 52

میکانیزمەکانی بەرگریکردن لە ئاستی نێونەتەوەییدا .......... 54

1. هۆکارەکانی چوونەسەری ویستە و دەرخستە .......... 55

2. هۆکارەکانی کەمبوونەوەی ویستە و دەرخستە .......... 56

دەرەنجام .......... 58

## پێشەکی

ئەم نووسراوەیە، پوختەی نامەیەکی ماستەرە دەربارەی قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان، کە لە بەشی یاسا نێونەتەوەییەکان لە ساڵی 2001 دا ئامادە کراوە.

ئەم نامەیە لە لایەن ناوەندی خەبات لە دژی ماددە هۆشبەرەکانەوە پاش پێداچوونەوە لە 357 لاپەڕەدا چاپکراوەو لەلایەنی مێژوویی، سیاسی، یاسایی، بەرهەمهێنان، دابەشکردن‌و رەهەندە نیشتمانی‌و جیهانییەکانی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان، ترانزێت‌و قاچاخی نێونەتەوەیی ئەو ماددەیە دەکۆڵێتەوە.

لەم کورتە باسەدا، ئەو بابەتانەی سەرەوەو گۆڕانکارییە یاساییەکان‌و هەنگاوە نێو نەتەوەییەکان، خەباتی جیهانی لە دژی قاچاخ‌و خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان‌و گرنگترین ئاستەنگەکانی سەر رێی کۆماری ئیسلامیی ئێران لە بەربەرەکانیکردن لەگەڵ ترانزێتی ماددە هۆشبەرەکان‌و رێگاچارە نێو نەتەوەییەکان بۆ پێشگیریکردن بە کورتی خراونەتە روو، هیوادارم جێی رەزامەندی بێت.

سوپاسی بێپایان بۆ نووسەری ئەم بەرهەمە بەرێز (عەلی مورتەزەوی).

**محەممەد عەلی زەکەریایی**

**بەڕێوەبەری گشتی ناوەندی توێژینەوەکان،**

**بارهێنان و تەکنەلۆژیا**

مادده هۆشبەرەکان وەك بەڵایەکی کۆمەڵایەتی، دیاردەیەکی زیانبەخش و ماڵوێرانکەر و پەتایەکی گەورەی جیهانی ناسێنراوە. کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەر لە سەرەتاوە تاکو ئێستا، دەستەویەخەی گەلێك بەڵاو قەیرانی جۆراوجۆر بووە، کە هەندێکیان مانو بەردەوامبوونی مرۆڤی خستۆتە مەترسییەوەو بەشێکیان نەخشەی سیاسیو جوگرافیایی جیهانیان گۆڕیوە. کێشەی مادده هۆشبەرەکان و تلیاك کێشان لە هەموو وڵاتاندا ریشەیەکی مێژووییان هەیە، بەڵام ئەو شتەی کە ئەم دیاردەیەی کردۆتە پەتایەکی جیهانی و هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەییو هۆکارێکی زیانبەخش بۆ سەر سەلامەتی فیکری، جەستەیی و ئەخلاقی ئینسانەکان، بریتییە لە قاچاخی نێونەتەوەیی ئەو ماددەیەو پەرەسەندنی ئەم بازرگانییە دزێوە مەرگهێنەرەو خراپ بەکارهێنانی لە ئاستی جیهاندا. بازرگانیکردن بە جۆرەکانی مادده هۆشبەرەکانەوە، دوای بازرگانی چەكو تەقەمەنی، پرقازانجترین بازرگانییە لە ئاستی جیهاندا[1]. هەر بۆیە لە پرۆسەی ئابووری جیهانیدا، تاکرێ شوێنگەی مادده هۆشبەرەکان لەبەرچاو نەگرین. بەردەوامبوونی ئەم بازرگانییە بەستراوەتەوە بە داخوازی بۆ بەکارهێنانی ئەو ماددەیە. هەتا داخوازی بۆ کێشانی مادده هۆشبەرەکان بچێتە سەر، بازاڕی رەشی ئەم بازرگانییە مەرگهێنەرەش رەونەق پەیدا دەکا.

سەرباری بوونی پەیماننامە نێو دەوڵەتییەکان، هەوڵی کۆمەڵگەی جیهانیو رێکخراوە جیهانییەکانو قاچاخی نێو نەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان، رۆژ بە رۆژ پەرەی سەندووەو هەنگاوە نیشتمانییەکانی وڵاتان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم دیاردەیەو خەبات لەدژی ئەو ماددەیە هیچ ئاکامێکی بەدواوە نەبووە.

---

1- رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان قازانجی ساڵانەی بازرگانیکردن بە ماددەهۆشبەرەکان بە 400 تا 600 ملیارد دۆلار خەمڵاندووە.

نووسەر لەم بەرهەمەمدا هەوڵیداوە رەهەندە مێژوویی، سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی ماددە هۆشبەرەکان شرۆڤە بکاو، رەوشی ئەم دیاردەیە لە رووی ترانزێتو قاچاخی نێونەتەوەیی ئەو ماددەیە لە ئاستی جیهاندا و هەروەها هەوڵی دەوڵەتو رێکخراوەکان لە ئاستی نەتەوەیی‌و نێونەتەوەییدا، بەشێوەیەکی گشتی، نیشان بدا و ئیرادەی نێونەتەوەیی بۆ خەبات لە دژی قەیرانی ماددە هۆشبەرەکانو بە سەرنجدان بە خەسڵەتی هەڕەشەکەرانەی ئەو ماددەیە، پێویستی گرتنە پێشی ستراتیژێکی کاریگەریی نیشتمانی‌و هاوکارییە نێو نەتەوەییەکانو هاوئاهەنگکردنی بەرنامەی نیشتمانی وڵاتان دەربڕێو میکانیزمی پێشگیرانەی نێو نەتەوەیی، سەبارەت بە کۆنترۆڵکردن‌و کەمکردنەوەی کڕین‌و فرۆشتنی نایاسایی‌و خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، بخاتەڕوو و رێگاچارەکانی خۆی بۆ بەربەرەکانیکردن لەگەڵ ئەم دیاردەیە لە ناوخۆی وڵاتدا نیشان بدات.

## پێناسەکان

### ماددەی هۆشبەر[1]

مانای ئەم وشەیە بریتییە لە ماددەیەکی سستکەرو ئەو شتەی کە مێشك‌و دەماخ سستو سڕ دەکاو بە شێوەیەکی تایبەتی بە ماددەیەك دەوترێ کە ویستو ئیرادەو کرداری مرۆڤ لاوازو ناهەموار دەکاو جەستەش پیرو پەککەوتە دەکا.

---

1- ماددە هۆشبەرەکان، بەو ماددەیە دەڵێن کە لە ژێر چاودێری تاقە رێکەوتننامەی ماددەهۆشبەرەکانی پەسەندکراوی 1961و رێکەوتننامەی ماددە سەرخۆشکەرەکانی پەسەندکراوی 1971و رێکەوتننامەی ماددە هۆشبەرەکانو ماددە سەرخۆشکەرەکانی پەسەندکراوی 1988دا بووەو لە خشتەی ژمارە1و2و رێکەوتننامەی 1961و خشتەی ژمارە 1، 2، 3، و4ی رێکەوتننامەی 1971دا باسی کراوە.

## گیرۆدەبوون (اعتیاد)

گیرۆدەبوون بە ماددە هۆشبەرەکان، بریتییە لە ژەهراوییبوونی لە رادەبەدەر یان درێژخایەن کە زیان بەتاك و کۆمەڵ دەگەیەنێ‌و بە دەرەنجامی بەکارهێنانی دەرمانی سروشتی یان کیمیایی لە قەڵەم دەدرێ. تایبەتمەندییەکانی ئەم حاڵەتە بریتین لە داواکاریی‌و پێویستی بۆ بەردەوامبوون لە سەر بەکارهێنان، حەز و مەیلێکی زۆر بۆ زێتر کێشان‌و گیرۆدەیی دەروونی‌و جستەیی بەو ماددەیە.

## خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان

بریتییە لە بەکارهێنانی نایاساییانەی هەرچەشنە ماددەیەکی هۆشبەری قەدەغەکراوو ئەو ماددانەی کە لە ژێر کۆنترۆڵی رێکەوتننامەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، پەسەندکراوی 1961و1971 دان‌و بە بێ مۆڵەتی پزیشکی‌و بۆ مەبەستی دیکە بەکاردەهێنرێن[1].

---

1- بە پێی رێکەوتننامە نێونەتەوەییەکان لە نێو 1000ماددەدا، 266 ماددە ناسراون و کۆنترۆڵکراون.

# پۆلێنکردنی جۆرەکانی مادده هۆشبەرەکان[1]

## - مادده ئەفیونییەکان

بەو دەرمانانە دەوترێن کە لە گیای خەشخاش و بنچکی کۆکا دروست دەکرێن و دەچنە خانەی دەرمانە ئەفیونییەکانەوە[2] و ناسراوترینیان بریتین لە تلیاك (Opium)، مۆرفین (Morphin)[3]، هیرۆین (heroine) کۆدئین (Codein)و کۆکاین[4].

## - ماددەی کانابس

کانابس، بە بەرهەمەکانی گیای شادانە (Gallow) دەوترێ و گراس (Cheras)و ماری جوانا دوو دەرمانی هۆشبەری سەر بەم گرووپەن.

## - دەرمانە سەرخۆشکەرەکان

دەرمانە سەرخۆشکەرەکان یان سایکوتروپ، بەو بەرهەمە دەرمانی، کیمیایی و پیشەسازییانە دەوترێن کە کاردەکەنە سەر سیستمی ناوەندی

---

1 - رێکخراوی تەندروستی جیهانی مادەهۆشبەرکانی بە چوار دەستە دابەشکردووە کە بریتین لە:

أ. ماددەهۆشبەرکان.

ب. ماددە سەرخۆشکەرەکان 3. کحوول 4. تەماکۆ لە لایەنی تەندروستی و کاریگەری لە سەر مرۆڤ لە ناستی نێونەتەوەیدا هەمان هەنگاوی هاویشتووە.

2- ئەفیون لە وشەی یونانی ئەپیون (Apiyin)ەوە وەرگیراوە بەو کەسەی کە خووی بە خواردن یان کێشانی تلیاکەوە گرتبێ، دەڵێن ئەفیونی.

3- لە هەر 10 کیلۆگرام تلیاك، یەك کیلۆ مۆرفین و لە هەردوو کیلۆگرام مۆرفین کیلۆیەك هیرۆین بە دەست دەهێنرێ. بۆ دروستکردنی یەك کیلۆگرام هیرۆین پێویستە بیست کیلۆ تلیاك بەکاربهێنرێ.

4- لە بەرهەمەکانی دیکەی تلیاك دەکرێ ناوی متادۆن، دیۆنین، تارکۆنین، پاپاورینی ڤالیوم، نارسین، تبایین و ناترۆپین و بیست جۆری دیکە بهێنین کە تێکڕا بۆ بواری چارەسەرکردن و پزیشکی و وزەبەخشین بەکاردەهێنرێن و بەکارهێنانی بەردەوامیان مرۆڤ گیرۆدە دەکا.

دەمارەکانی لەش و بە سەر سێ بەشی ماددەی سەرخۆشکەر (نەشەکەر- هالوسینیوژیەکان)، ماددە هاندەر و بەهێزکەرەکان (نافتامینەکان)و ماددە هێورکەرو سڕکەرەکان (باربیتورتییەکان و بزۆدیازیپینەکان)دا دابەش دەبن[1].

## ڕەوتی مێژوویی ماددە هۆشبەرەکان

لە کۆنەوە تلیاک بۆ هێورکردنەوەی ئازارو دەرمانکردن بەکارهێنراوەو هۆیەك بووە بۆ چێژوەرگرتن و دەرچوون لە خەم و پەژارە[2].

نزیکەی 600 ساڵ بەر لەدایك بوونی مەسیح، بیرمەندە یۆنانییەکان باسیان لە کاریگەری پزیشکی تلیاك کردووە و گوڵی خەشخاشیان بە یەکێك لە گوڵە جوانەکان ناوبردووە[3]. محەمەد زەکەریای رازی، زاناو پزیشکی ئێرانی سەدەی سێیەم و چوارەمیش تلیاك و خەشخاش و شادانەی وەك دەرمان بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان بەکارهێناوە[4]. یەکەمین نیشانەی کۆلۆنیالیزم لە چیندا بە بازرگانیکردنی تلیاك بە هۆی ئینگلیزییەکانەوە دەستیپێکرد. لە ئێرانیش کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا بناغەدانەرو ڕەواجپێدەری ماددە هۆشبەرەکان بووەو لەسەردەمی سەفەویدا، چاندنی خەشخاش و بەکارهێنانی تلیاکیرەوی پەیداکردووە. لە سەدەی رابردوودا، ماددە هۆشبەرەکان و پەرەسەندنی جۆرەکانی ئەو ماددەیە، وەك کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، سیاسی بەم دواییانەش وەك قەیرانێك لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا خراوەتە بەرنامەی کارەوە. لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمی نوێدا

---

1- بە پێی ڕێککەوتننامەی ماددە هۆشبەرکان 111 ماددەی سەرخۆشکەر لە ژێر کونترۆڵی ڕێککەوتننامەی 1971دا پەسند کراون.

2- سوقرات، حەکیمی گەورەی یۆنانی تلیاکی بۆ چارەسەرکردنی سکچوون بەکارهێناوە.

3- ئیبراهیم واحید، گیرۆدەبوون بەماددە هۆشبەرەکان، بەخشی سوبحان، 1998

4- سەید مەحموودی تەبابەتایی، ئەلحاوی (وەرگێڕان) بەخشی بابا، 1990

بازرگانیکردن بە ماددە هۆشبەرەکانەوە بەنامانجی بەردەوامبوونی فەرمانڕەوایی بە سەر وڵاتە داگیرکراوەکاندا، رەنگ و بۆیەکی دیکەی بەخۆوە گرتووەو بە مەبەستی لە خشتەبردن‌و فرتوفێڵی دەرمانی‌و پلانی نابووری کەلکی لە نامرازە دژە کەلتوورییەکان وەرگرت و پانتایی ئەم پیلانانە هێرشی سەربازیشی گرتۆتەوە[1]. لە چەند دەیەی رابردوودا دەوڵەتە زلهێزەکان دەوریان هەبووە لە پەرەپێدانی ماددە هۆشبەرەکان لە جیهاندا و لە ئاستی نێونەتەوەییدا بواریان بۆ قاچاخ‌و ترانزیتی ئەم ماددانە فەراهەم کردووەو ئەم دیاردەیان کردووە بە پەتایەکی جیهانی و کێشەیەکی نەتەوەیی لە ئاستی وڵاتانداو شەڕی شاراوەی تلیاک، هەڕەشەیەکە بۆ سەر مرۆڤ.

## رەوشی کشتی بەرهەمهێنان و مەسرەفکردنی ماددە هۆشبەرەکان لە جیهاندا

لە ساڵی 1985 بە دواوە چاندنی نایاسایی کۆکاو خەشخاش رووی لە زیادبوون کردووەو تا ساڵی 1996 پانتایی ئەو زەویانەی کە ئەم ماددانەیان تێدا چێنراوە، لە ئاستی جیهاندا گەیشتۆتە 280 هەزار دۆنم[2]. بە پێی ئامارو راپۆرتە بڵاوکراوەکان تەنیا لە دوو وڵاتی ئەفغانستان‌و بێرمەدا 34 لە سەدی خەشخاش بە شێوەی نایاسایی بەرهەم دەهێنرێ[3]و نزیکەی 90٪ی تلیاکی خۆراکی لە ئاستی جیهاندا لە دوو ناوچەی ناسراو بە کەوانەی

---

1- یەکەم شەڕی تلیاک لە ساڵی 1838و دووەم شەڕیش لە ساڵی 1856دا لە نێوان دەوڵەتی کۆلۆنیالی بریتانیاو چیندا تۆمار کراوە.

2- لە 10 پارێزگا لە 29 پارێزگای ئەفغانستاندا خەشخاش بەرهەم دەهێنرێ.

3- هەر لەم ساڵە (1996)دا پانتایی ئەو زەویانەی کە بە شێوەی یاسایی خەشخاشیان تێدا بەرهەمهێنراوە، بە 106.000 مەزەندە کراوەو بە سەرنجدان بە بەربڵاوی زەوییە کێڵدراوەکان لە ساڵی 1995دا بەرهەمهێنانی یاسایی ماددەهۆشبەرەکان لە جیهاندا گەیشتۆتە 2230 تەن تلیاک و زیاتر لە 250تەن مۆرفین.

زێڕینو سێ گۆشەی زێڕیندا بەرهەم دەهێنرێ[1]. لە وڵاتی پێرو، بولیڤیو کۆلۆمبیادا، زۆرترین بنچکی کۆکا دەچێنرێو بە شێوەیەکی گشتی 98٪ کۆکای جیهان لەم سێ وڵاتەدا بەرهەم دەهێنرێ. بەرهەمهێنانی تلیاك لە ناوچەکانی سێ گۆشەو کەوانەی زێڕین لە ساڵی 1990دا بەرز بۆتەوە[2]. لە وڵاتانی دیکەی جیهاندا بۆ وێنە ئوستراليا، فەرەنسا، هیند، تورکیا...هتد، هەروەها پانتایی زەوییە کێڵدراوەکانو بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە ساڵی 1990 بە دواوە زیادی کردووە[3].

بە پێی ئاماری UNDCP [4] رادەی بەکارهێنانی نایاسایانەی ماددە هۆشبەرەکانیش زیادی کردووە. ئەم رادەیە لە چاو حەشیمەتی جیهاندا 3.3٪ تا 1.4٪ (رادەی پەرە گرتن)و 2.5٪ حەشیمەتی جیهان کانایس دەکێشن کە نزیکەی 140 ملیۆن لە حەشیمەتی جیهان لە خۆ دەگرێ.

هەروەها نزیکەی 8 ملیۆن کەس لە جیهاندا هیرۆیینو نزیکەی 13 ملیۆن کەس کۆکایین دەکێشنو وڵاتانی ئەمریکای باکوور، ئەورووپا، ئەمریکای باشوورو ئەفریقا یەك لە دوای یەك زۆرترین رێژەی خراپ بەکارهێنانی

---

1- لە نێو قاچاخچییە نێو نەتەوەییەکانو لە قاموسی ماددە هۆشبەرەکاندا وڵاتانی بێرمە، لائۆس، تایلەنو چین کەوتوونەتە نێو سێ گۆشەی زێڕینو وڵاتانی ئەفغانستان، پاکستان، لوبنانو تورکیا کەوتوونەتە نێو کەوانەی زێڕینەوە.

2 لە ئەفغانستاندا بەرهەمهێنانی تلیاك لە ساڵی 1990دا 415 تەن بووەو لە ساڵی 1999دا گەیشتۆتە 4565 تەنو پانتایی ئەو زەوییانەی کە خەشخاشیان تێدا چێنراوە لە 12375 دۆنمەوە گەیشتۆتە 90583 دۆنم. لە وڵاتی میانمار (بێرمە)شدا بەرهەمهێنانی تلیاك لە 2255 تەن لە ساڵی 1990دا گەیشتۆتە 2575 تەن لە ساڵی 1994دا.

3- بە پێی راپۆرتی UNDCP زەوییە بە خەشخاش چێنراوەکان لە جیهاندا لە ساڵی 1999 لە 219000 دۆنم زیاتر بووە.

4- بەرنامەی نێو نەتەوەیی کۆنترۆڵکردنی ماددە هۆشبەرەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان

کۆکـاین لـە خـۆ دەگـرن[1]. بەرهـەمهێنانو خـراپ بـەکارهێنانی مـاددە سەرخۆشکەرەکان لە کۆتاییەکانی دەیەی 80 لە جیهانـدا زیـادی کـردووەو نزیکەی 30 ملیۆن کەس گیرۆدەی ئەم ماددەیـە بـوون. بـە پێـی راپـۆرتی کۆڕی گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لـە سـاڵی 1998دا ژمـارەی گیرۆدەبووەکانی جیهان گەیشتۆتە 445,6 ملیۆن کەس، کە لەم ژمارەیـە 3.318 ملیۆن کەس بە ماددە هۆشـبەرەکان گیرۆدەبـوون و، ئـەم ژمارەیـە 3,78٪ی ئەم دانیشتوان لە خۆ دەگرێ و 92, 3٪ لە دانیشتوانی جیهانیش خوویان بە ماددەی هێورکەر و سڕکەرەوە گرتووە[2]. لێکۆڵینەوەکان و ئامارە فەرمییە بڵاوکراوەکان باس لەوە دەکەن کە زیاتر لە 94٪ی تەواوی مـاددە هۆشبەرەکان لە ئاسیاو لـە دوو ناوچـەی ناسـراو بـە سێگۆشـەی (زێـڕینو کەوانەی زێڕین)دا بەرهەم دەهێنرێنو بە هـۆی تـۆڕە مافیـاییو قاچاخـچییە نێونەتەوەییەکانەوە دەخرێنە بازاڕەکانی جیهانەوەو هەندێ لە وڵاتانی ئاسـیای ناوەڕاستو ئەمریکای باشووریش دەچنە ریزی گەورە بەرهەمهێنـەرانی مـاددە هۆشـبەرەکانەوە، وڵاتـانی پیـشەسازی ئـەوروپایی، بـازاڕی گـەورەی کـڕینو فرۆشتنی نایاسایی ماددە هۆشبەرەکانن‌و ئەم ماددانە بـە قاچـاخ لـە وڵاتـانی هەژارو بەرهەمهێنەرەوە دەنێردرێن بۆ ئەم وڵاتانە.

ئەو زانیارانەی لە وڵاتە ئەوروپاییەکانەوە بە دەست هاتوون نیشان دەدەن کە خووگرتنی لاوەکان بەم ماددەیە روو لە زیاد بوونەو رەوشی گیرۆدەبوون لـەم وڵاتانەدا جێی نیگەرانییە، چونکە ((مـاددە هۆشـبەرەکان ژیـانی مـرۆڤ و

1- راپۆرتی جیهانی ماددە هۆشبەرکانو گیرۆدەبی سەر بە رێکخراوی نەتـەوە یـەکگرتووەکان لە ساڵی 1997دا

2- باربیتۆرو بنزۆدیازیپـنەکان ماددەی هێورکەرەوەو سڕکەرن کە بـەکارهێنانی بـەردەوامیان دەبێتە هۆی گیرۆدەبوون‌و هەندێکیان کەوتوونەتە ژێر کۆنترۆڵی رێکەوتننامەی نێونەتەوەیی 1961و 1971.

کۆمەڵگەکان دەفەوتێنێ‌و زیان بە رەوتی بەردەوامی پەرەسەندنی مرۆیی دەگەیەنێ، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی تاوان. زیان بە گرنگترین سەروەتو سەرمایەی جیهانی، واتە ئازادی‌و گەشەکردنی لاوان دەگەیەنێ، بە مەترسیەکی گەورە بۆ سەر لەشساغی‌و ئاسوودەیی ئینسانەکان، سەربەخۆیی وڵاتان‌و دیوکراسی‌و سەقامگیری وڵاتان لە قەڵەم دەدرێ))[1].

## دۆزینەوەی مادده هۆشبەرەکان لە ئاستی نێو نەتەوەییدا

بە چاو خشاندنێك بە سەر ئاماری مادده دۆزراوەکان لە ئاستی نێو نەتەوەییدا دەکرێ بەو ئاکامە بگەین کە سەرجەمی ئەم دۆزینەوانە کەمترە لەو رادە تلیاکەی کە لە کۆماری ئیسلامیدا گیراوە. هەروەها زۆرترین تلیاکی دۆزراوە لە ئاسیاشدا لە ئێراندا بووە. لە ماوەی ساڵەکانی 1978 تا 1994دا دۆزینەوەی هیرۆین زیادی کردووە. رادەی دۆزینەوەی ئەم ماددەیە لە ئەمریکاو کەنەداو دوازدە وڵاتی ئەوروپاییدا لە 2509 کیلۆگرام لە ساڵی 1987دا گەیشتۆتە 6069 کیلۆ گرام لە ساڵی 1993داو هەر لەم ساڵەدا ئاماری دۆزینەوە بڵاوکراوەکان لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا (مادده هۆشبەرەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە) زیاتر لە 163 تەن بووە کە نزیکەی 25 تەنی هیرۆین و مۆرفین بووە[2]. لە ماوەی ساڵانی 1990 تا 1996دا زیاتر 70٪ی تلیاکی دۆزراوەو 90٪ی مورفینی دۆزراوە هەروەك جاران لە ئێراندا بووە[3].

---

1- گوڵبژێری راگەیەنراوی سیاسی دوازدەهەمین کۆنفرانسی وەزیرەکانی کۆڕی گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پێوەندی لەگەڵ خەبات لە دژی ماددەهۆشبەرەکان، ساڵی 1998.

2- UNDCP و بەرنامەی کونترۆڵی مادده هۆشبەرەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە راپۆرتی خۆیدا بۆ کۆنفرانسی نیۆرك لە ساڵی 1998دا ماددەی هۆشبەر بە قاچاخ بەرهەمهێنراوی لە ساڵی 1997دا بە 500 تەن خەمڵاندووە.

3- راپۆرتی راوێژکارە یاساییەکانی UNDCP لە کۆبوونەوەی رەهەندە نێونەتەوەییەکانی قاچاخکردنی مادده هۆشبەرەکاندا.

سکرتارییەتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە راپۆرتی ساڵی 1995ی خۆیدا رایگەیاند، سەرجەمی دۆزینەوەکانی تلیاك لە جیهاندا کەمتر لە دۆزینەوەکانی ئێران بووە.

سەرباری پێشکەوتنی وڵاتە ئەورووپییەکان لە تەکنەلۆژیای زانیاریو ئەلەکترۆنیو پۆلیسیدا، ئاماری دۆزینەوەکان لە کۆماری ئیسلامی ئێراندا بەرچاو بووەو ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە ئەم وڵاتانە لە خەبات دژی قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان جددی نەبوون.

# ڕەوشی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا

## کورتە مێژووی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا

لە مێژووو ئەدەبیاتی ئێراندا، تاکوو ئێستا سەرەتایەکی تەواو بۆ کێشانو ڕەواج پەیداکردنی مادده هۆشبەرەکان بەدەست نەهاتووە، بەڵام هەندێ نووسراوە هێرشی عەرەبەکان بۆ ئێرانیان بە بنەمایەك بۆ ڕەواجدانی ئەفیون لە ئێراندا زانیوە[1]. هەروەها دەڵێن کە دوو وشەی ئەفیونو تلیاك لە زمانی یۆنانییەوە هاتوونەتە نێو زمانی عەرەبیو فارسی. لە کتێبی ئاڤێستا (ئێرانی کۆن)دا گیای کانابیس (شادانە) وەك ماددەیەکی سڕکەر ناوبراوە، بەڵام لە ئێرانی کۆندا گیرۆدەی مادده هۆشبەرەکان نەبوون[2]. ئەبوو ڕەیحانی بیروونی زانای هاوچەرخی ئیبن سینا لە بەرهەمەکانی خۆیدا ئاماژەی بە کێشانی ئەفیوونو تایبەتمەندییەکانی کردووەو محەمەد کوڕی زەکەریای رازی و ئیبن سینا تایبەتمەندییە دەرمانییەکانی تلیاکیان ناسیوەو وەك دەرمان بۆ چارەسەری نەخۆشەکانی خۆیان بەکاریان هێناوە[3]. هەندێ لە شاعیرەکانیش لە شیعرەکانی خۆیاندا ئاماژەیان بە ئەفیوون، کەنار، بەنگ و تایبەتمەندییەکانی کردووە[4]. لە سەردەمی سەفەویدا کێشانی مادده هۆشبەرەکان زیادی کردووە لە ماوەی 22 ساڵ فەرمانڕەوایی شاکانی سەفەویدا، کێشانی تلیاك، حەشیش و خواردنەوەی شەراب لە ئێراندا بە

---

1- ئەمیر هوشەنگی مێهریار، ڕایردووی مێژوو بە بەرهەمهێنانو خراپ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا، کاری توێژینەوەیی لە دامەزراوەی بەرزی توێژینەوە لە بەرنامەڕێژیو پەرەسەندن، 1997.

2- تاج زەمان دانش، کێ تاوانبارە، چاپەمەنی ئەمیرکەبیر، ل 286، 1990.

3- جەمیلە نوورەنگ، توێژینەوە دەربارەی گیرۆدەبوون، ڕێکخراوی چاپو بڵاوکردنەوە، 1988.

4- هەندێ لەو شاعیرانەی کە لە بەرهەمەکانی خۆیاندا واژەو تایبەتمەندییەکانی مادده هۆشبەرەکانیان بەکارهێناوە، بریتین لە خاقانی، نزامی، سەنایی و حافز.

شێوەیەك پەرەی گرتووە کە بەرهەمی ناوخۆیی، نەیتوانیوە پێویستی داخوازیکارەکان دابین بکاو بۆ یەکەمین جار شا تەهماسبی سەفەوی وێرای وازهێنان لەو ماددەیە، دەستی کردووە بە خەبات دژی کێشانی ماددە هۆشبەرەکان. سەرباری توندبوونی خەبات دژی گیرۆدەبوون (ئیدمان) لەم سەردەمەدا، ماددە هۆشبەرەکان پەرەیان سەندووە. زۆربەی دەوڵەتەکان گیرۆدەی ماددە هۆشبەرەکان بوون و لە چایخانەکاندا کەوتوون و رەوشەکە بە چەشنێك بووە کە ئێرانییەکان هەرکات ویستوویانە سەرخۆش بن، تلیاکیان کێشاوە[1].

هاوکات لەگەڵ پاشایەتی نەسرەدین شای قاجاردا و لەگەڵ هاتنی بەریتانییەکان بۆ ئێران، تلیاککێشان بوو بە رەسمی و وێنەی پاشا لە سەر کەلەی بافوورەکەدا دەنەخشێنرا، بە چەشنێك کە لە ساڵی 1935دا ژمارەی گیرۆدەبوونەکان گەیشتۆتە یەك ملیۆن و پێنج سەد کەس، واتە 7٪ی تەواوی حەشیمەتی وڵات. لەم سەردەمەدا، ئابووری ئێران بەستراوەتەوە بە تلیاکەوەو دوای نەوت، تلیاك گرنگترین کاڵای هەناردەی ئێران بووە[2].

بە پێکهێنانی حکومەتی پەهلەوی، سەرباری دانانی دەستورو دامەزراندنی رێکخراوی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان، حەشیمەتی گیرۆدەبوونی وڵات زیادی کرد و لە ساڵی 1978دا زەوی کێڵدراو گەیشتە 33 هەزار دۆنم.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامیش، سەرباری ئەوەی کە ساڵانە زیاتر لە 700 ملیارد تمن خەرجی خەبات دژی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان دەکرێ

---

1- موحسینی جاویدان، پزیشکی لە سەردەمی سەفەویدا، چاپەمەنی زانکۆی تاران 1978.

2- ئێوندی هەناردەی تلیاکی ئێران لە ساڵەکانی 1922 تا 1943 لە ساڵێکدا نزیکەی 3/7 ملیۆن تمن بووە و لە ساڵی 1947 دا هەناردەی تلیاکی ئێران گەیشتووەتە 154 تمن.

و زیاتر له چوار هەزار ملیارد ریال سەرمایەی دەزگاکانی جێبەجێکردنی ولآتیش خەرجی خەبات دژی ئەم دیاردەیەکراوە، هێزو توانای قاچاخچییەکانو ژمارەی گیرۆدەبوونەکان روو لە زیاد بوونەو خابن هێشتا سەرکەوتنی تەواو بە دەست نەهاتووە. لە ئێراندا تەمەنی گیرۆدەبوون گەیشتۆتە 28 ساڵ، 64٪ی حەشیمەتی گیرۆدەبوونی ولآت لە خوار 35 ساڵو 11٪ی ئەو رێژەیە لە سەرووی 18 ساڵداو هەر ساڵێك نزیکەی 200 تەن ماددەی هۆشبەر لە ئێراندا بەکار دەبرێ[1].

## رەوتی یاسادانان و خەبات لە دژی مادده هۆشبەرەکان

### أ- بەر لە شۆرشی ئیسلامی

بەر لە شۆرشی ئیسلامی و (لە ساڵی 1910 تا 1978 ) خەبات دژی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان بە ماوەی 68 ساڵ هیچ ستراتیژییەکی روونو سیاسەتێکی درێژ خایەنی نەبوو هەموو هەنگاو و بەرنامەکان لە ژێر کارتێکەری تێروانینو سیاسەتی دەوڵەتەکانی سەردەمدا بووە و پەسندکرانی 52 یاسا و بریارنامەو پێرەوی ناوخۆیی بە درێژایی ئەم ساڵانە بە گشتی لە ژێر کارتێکەری فشارە نێو نەتەوەییەکان و باروودۆخی ناوخۆییدا ئەنجام دراوە. دوای کۆنفرانسی شانگهای لە ساڵی 1910ی زایینیدا، یەکەمین یاسا نووسراوە بە ناوی یاسای سنووردارکردنی تلیاك لە لایەن مەجلیسی شورای نیشتمانییەوە پەسەند کرا[2]. لەم یاسایەدا هیچ چەشنە سنووردارییەك بۆ

1- حشامەتی- محەممد جەواد- جێگری بنکەی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان- رۆژنامەی «انتخاب» 78/4/23.

2- کۆنفرانسی شانگهای لە ساڵی 1909 بە بەشداری 13 ولآت و یەك لەوان ئێران لە بەندەری شانگهای چیندا بەستراو دوای 25 رۆژ بە پەسندکردنی بریارنامەیەکی 8 ماددەیی کۆتایی بە کارەکانی خۆی هێنا.

چاندن‌و بەرهەمهێنانی تلیاك پێشبینی نەکراوەو بۆ هەر مسقاڵێ تلیاك 300 دینار باج دیاری کراوە.

بە دەستپێکردنی قاچاخی کۆکایین‌و مۆرفین، لە ساڵی 1922 دا یاسای ڕێگرتن لە هێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا دانراو لە ژێر فشارە نێونەتەوەییەکان و مەحکومکرانی ئێران لە کۆمەڵی نێو نەتەوەییدا[1]، لە پووشپەڕی 1928 دا یاسای پاوانکردنی تلیاك لە 16 ماددەدا پەسەندکراو چاندنی خەشخاش کەوتە ژێر چاودێری دەوڵەت‌و دامەزراوەیەك بە ناوی ((پاوانی دەوڵەتی)) دامەزرا[2]. سەرباری ئەو کارانەی لەم بوارەدا کراون، هەناردەی تلیاك ڕووی لە زیادبوون کردووەو ڕادەکەی لە 291539 کیلۆگرام لە ساڵی 1929 دا گەیشتۆتە 448362 کیلۆ گرام لە ساڵی 1928دا. لە ساڵی 1933دا یاسای سزادانی قاچاخچییەکانی ماددە هۆشبەرەکان پەسەند کراو لە ساڵی 1938 دا بڕیارنامەی قەدەغەکردنی چاندنی خەشخاش لە 32 ناوچەی ئێراندا جێبەجێکرا. دەوڵەتی ئێران لە ژێر فشاری نێونەتەوەیی و دژکردەوەی نێو نەتەوەییدا بە شێوەی فەرمی لە ساڵی 1945دا گەلاڵەی پەیوەستبوونی بێ شەرت و مەرجی ئێرانی بە ڕێکەوتنامەی نێونەتەوەیی تلیاك بردە پەرلەمان‌و بە پەسەندکردنی، یاسای قەدەغەکردنی چاندنی خەشخاش و خەبات لە دژی قاچاخ‌و چارەسەرکردنی گیرۆدەبوونەکانی ئیمزا

1- لە ڕاپۆرتی لیژنەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ژنێڤدا، ئێران وەك هۆکاری گەندەڵی‌و گیرۆدەبوون‌و بەرپرسی دابینکردنی تلیاك بۆ گیرۆدەبوونەکانی ناوچەکانی دیکەی جیهان ناسراوە.

2- ئەم دامەزراوە بە چاودێری کەسێکی بەریتانی دامەزراو وێڕای ئیدارەکردنی پاوانی وردەفرۆشی تلیاك، بە دروشمی کاریگەری هێورکەرەوەو دەرمانی تلیاك هۆکارێکی گەورە بووە لە پەرەپێدانی تلیاك‌و شیرەکێشخانەکانی ئێراندا.

کرد. بە هاتنە سەرکاری دەوڵەتی عەبدولحسێنی هەژیر لـە سـاڵی 1947 دا ئەم یاسایە هەڵوەشێنرایەوەو چاندنی خەشخاش بە شێوەی یاسـایی رێگـەی پێدرا. سەر لە نوێ لە ساڵی 1953 دا یاسای قەدەغەکردنی بەرهەمهێنانو کڕینو فرۆشتنی ماددە هۆشبەرەکانو خواردنـەوە کحولییـەکان لـە لایـەن پەرلەمانەوە پەسەند کرا. لـە بـەفرانباری 1955 دا یاسـای قەدەغـەکردنی چاندنی خەشخاشو تلیاك کێشانیش پەسـەند کـرا کـە لـە مـاددەی 13ی پـەیرەوی ناوخۆیـدا، پێکهێنـانی رێکخـراوی خـەبات دژی تلیـاك خرایـە بەرنامەوە. هەر لەم ساڵەدا، بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێرانـدا بە 900 تەن راگەیەنراوە کـە لـەم رادەیـە 100 تـەنی نێردراوەتـە دەرەوەی وڵات و 800 تەنیشی لە ناوخۆدا مەسرەف کراوە[1]. بە پەسەند کردنـی ئـەم یاسایە بۆ ماوەی 13 ساڵ چالاکی بـەربڵاو دژی بەرهـەمهێنان، قاچـاخ و کێشانی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێراندا ئەنجام دراوە، سـەرباری سـەرکەوتنە رواڵەتییەکانو پێداهەڵگوتنی زێدەڕۆییانەی رێکخـراوە نەتەوەییـەکان، لـە وەرچەرخانێکی خێرا لـە سـاڵی 1968دا، یاسـای رێگەپێـدان بـە چـاندنی خەشخاشو ناردنە دەرەوەی تلیاك لە لایەن مەجلیسی شورای نیشتمانییەوە پەسەندکراو هەموو ساڵێك لە لایەن ئەنجومـەنی وەزیرانـەوە ، بەشـێك لـە زەوییە کشتوکاڵییەکان بۆ چاندنی خەشخاش تـەرخان کـرا. لـەم سـاڵانەدا کۆشکی پاشایەتی (پەهلـەوی) قاچـاخکردنی مـاددە هۆشـبەرەکانی کـردە پاوانی خۆی، گیرۆدەبوون دەرەنجامە خراپەکانی پەرەیان سەندو ئەم رەوشە تا سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی درێژەی کێشا.

---

1- د. ساڵح، وەزیری تەندروستی ئەو کات، لە وتەیەکدا لە پەرلەمانی شورای نیشتمانی لە ساڵی 1955دا، ئاماری گیرۆدەبووەکانی بە 1.500.000 کەس راگەیاند.

**ب- دوای شۆڕشی ئیسلامی**

سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ڕێبەندانی 1978داو دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی، بە خاڵێکی وەرچەرخان لە مێژووی خەبات دژی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان لە ئێرانو جیهاندا لە قەڵەم دەدرێ. سەرباری پێویستی پێکهێنانی گۆڕانو وەرچەرخان لە بەشە گرنگەکانی وڵاتدا لە رووی سیاسی، ئابووری، کەلتووریو کۆمەڵایەتییەوەو هێرشی رژێمی عێراق لە خەرمانانی 1980دا، سەپاندنی شەڕی هەمەلایەنەی 8 ساڵە، مەسەلەی ماددە هۆشبەرەکان هەر لە نەولەویەتدا مایەوەو یاساو ڕێساکان و ستراکتوری ڕێکخراوی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان پێداچوونەوەی بەسەردا کرا.

لە ڕێکەوتی (3/19/ 1980) یاسای قورسکردنی سزای بەکارهێنەرانی ماددە هۆشبەرەکان و هەنگاوەکانی دابینکردن، دەرمانکردن، پەیداکردنی کار بۆ گیرۆدەبوونەکان، لە لایەن ئەنجومەنی شۆڕشی ئیسلامییەوە پەسەند کراو بە کردەوە فرۆشتنی تلیاك بە گیرۆدەبوونەکان لە لایەن دەوڵەتەوە کۆتایی پێهێنراو چاندنی خشخاش قەدەغەکراو کێشانی ماددە هۆشبەرەکان بە تاوان دانرا[1].

لە ساڵی 1365 (1986) بەدواوە بەرپرسیارێتی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان کەوتە ئەستۆی کۆمیتەی شۆڕشی ئیسلامی و ئەم دەزگایە، زنجیرە کردەو ئۆپراسیۆنو پلانێکی بۆ خەبات دژی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان و ترانزیتی ئەو ماددانە لە ڕێگای ئێرانەوە خستە بەرنامەی

---

1- بە پێی بڕیارنامەی فرۆشتنی تلیاك بە گیرۆدەبوونەکان، ڕێکخراوی مامەڵەکردنی تلیاکی سەر بە وەزارەتی کشتوکاڵ ڕێگەی پێدرا کە هەر گەرەم تلیاکێکبە نرخی 300 ریاڵ بەو کەسانە بفرۆشێ کە خاوەن کارتی رەسمینو بە پێی ئاماری بڵاوکراوە نزیکەی 170هەزار کەسی گیرۆدەبوون لە لایەن وەزارەتی تەندروستییەوە کارتی رەسمییان وەرگرتووە.

کاری خۆیەوەو بە گشتی بە سەرنجدان بە هەلومەرجی پاش شۆڕشی ئیسلامی، شەڕی سەپێنراو و لێبراوەییو خێرایی دادگاکانو کردەوەی چەکدارانەی کۆمیتەی شۆڕشی ئیسلامی، ئەو هەولانەی لەم قۆناغەدا ئەنجام دراون، تا رادەیەك پێشگیرانەو کاریگەر بووە.

رۆژی سێهەمی سەرماوەزی 1367 (1988) کۆڕی دیاری کردنی بەرژەوەندی نیزام، یاسای خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکانی پەسەند کرد[1]و بە پێی ماددەی 33ی ئەم یاسایە، ناوەندی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان بە سەرۆکایەتی سەرۆك وەزیران بە ئەندامێتی هەشت وەزارەتو رێکخراو دامەزرا[2]و خەبات دژی ماددە هۆشەرەکان پێی نایە قۆناغێکی دیکەوە. زەبرو زەنگ نواندن و سزادانی قورس(ئیعدام) و زیندانی درێژخایەن بەشێکن لە تایبەتمەندییەکانی ئەم یاسایە.

## رەوشی گیرۆدەبوون لە وڵات

بەپێی هەلسەنگاندنێکی گشتی لە سالی 1910دا، پشتیوانی نهێنی دەولەتانی پێش لە شۆڕشی ئیسلامیو بریکارانی حکومەت، تالانکردنی

1- ئەم یاسایە 35ماددەو 12 تێبینی لە خۆگرتووە و رەهەندە جۆراوجۆرەکانی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان بۆ وێنە هاوئاهەنگی لەگەل دەزگاکانی دیکە، هەنگاوی پێشگیریکەرانە، هاوهەنگاوی لەگەل پەیماننامە نێونەتەوەییەکاندا لە دارشتنی ئەم یاسایەدا رەچاو کراون.

2- سەرۆکایەتی بنکەی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان کە دوای پێداچوونەوەو پەسەندکرانی یاسای دەستلێدراوی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان لە سالی 1989دا درا بە سەرۆك کۆمارو وەزارەتی پەروەردەو فێرکردنیش بوو بە ئەندامی بنکە. ئەندامان بریتین لە: وەزیری ئیتلاعات، وەزیری ناوخۆ، وەزیری تەندروستی، وەزیری پەروەردەو فێرکردن، فەرماندەری ئاسایشی ناوخۆ، سەرۆکی رادیۆو تەلەفزیۆن و سەرۆکی بەندیخانەکان و...

سەرچاوە نەوتییەکان بە هۆی کۆمپانیا بیانییەکانەوە، پێویستی زۆری تابووری ئێران، یاسایی بوونی هەناردنی ماددە هۆشبەرەکان، دەکرێ گوێنەدان بە لایەنە کەلتووریو کۆمەڵایەتییەکانی ئەم دیاردەیەو رۆڵی خەڵك و هاوبەشی کۆشکی پاشایەتی لەگەڵ تۆڕەکانی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان[1] بە بەشێك لە هۆکارەکانی پەرەسەندنی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکانو گیرۆدەبوون لە وڵاتدا ناو ببەین کە هەنگاوی یاساییو (قەهری) نەیتوانیوە لەو پەیوەندییەدا کاریگەر بێ[2]. ئەگەرچی ئامارو زانیارییەکی وردو تەواو و وێنەیەکی کامڵمان لە بارودۆخی گیرۆدەبوون لە بەردەستدا نییە، بەڵام دەتوانین بارودۆخی گیرۆدەبوونو رەوشی خەڵکی گیرۆدەبوو بخەمڵێنین، بە پێی ئەو ئامارانەی کە لە ساڵی 1943دا بڵاوکراونەتەوە، ژمارەی گیرۆدەبووەکانی وڵات ملیۆنێك و 500 هەزار کەس راگەیەنراوە کە 10٪ی ژنەو تەمەنی گیرۆدەبوونەکانیش لە نێوان 15 تا 60 ساڵدایە. لەم ساڵەدا 1300 شیرەکێشخانە لە ئێراندا کراوە بوونو لە ساڵێکدا نزیکەی 5000 کەس بە هۆی تلیاکەوە خۆیان کوشتووە. لە ساڵی 1965دا دوکتۆر ساڵح وەزیری ئەو کاتی تەندروستی، لە وتارێکدا لە مەجلیسی شوورای میللیدا، ئاماری گیرۆدەبووەکان بە تلیاکی ملیۆنێك و 500 هەزار کەس داناو ئەنجومەنی ناحکومی خەبات دژی تلیاکو کحولیش لە راپۆرتێکدا رایگەیاند کە حەشیمەتی گیرۆدەبوون لە ساڵی 1980دا لەنێوان یەك ملیۆنو 700 هەزار تا 3ملیۆن کەس دایە. لە راگەیەندراوێکی

---

1- بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی رۆڵی دەرباری پەهلەوی لە مەسەلەی ماددەهۆشبەرەکاندا چاو لە کتێبی ((لە سێرەوە تاکو پیاز)) بکەن کە لە لایەن ئیبراهیم باستانی نووسراوەو هەروەها کتێبی ((ماددەهۆشبەرەکان و ئاسایشی کۆمەڵایەتی)) نووسینی حسێن شەهیدی.

2- لە ساڵی 1941دا دەوڵەتی ئەو کات یاسایەکی راگەیاند کە بەو پێیە گیرۆدەبووەکان فایلیان بۆ دروست بکرێو بە پێی پێویستییان تلیاکیان دابین بکرێ و ئەم دۆخە تا سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی درێژەی کێشا.

دیکەی ئەم ئەنجومەنەدا کە ساڵی 1994 لە ڕۆژنامەی (اگلاعات)ی ژمارە 5863 دا بڵاوکرایەوە، ژمارەی گیرۆدەبووەکان لە سەرووی یەک ملیۆن و 500 هەزار کەس ڕاگەیەنراوە. هەروەها ڕۆژنامەی (اطلاعات) لە ساڵی 1970و لە ژمارە 13386ی خۆیدا ژمارەی گیرۆدەبوونەکانی لە نێوان ساڵەکانی 1967 تا 1970 بە زیاتر لە دوو ملیۆن کەس ڕاگەیاندووەو بە پێی وتەی پۆلیسی نێو نەتەوەیی هەر لەم ساڵانەدا (1967) ڕێکخراوی خەبات لە دژی مادده هۆشبەرەکانی ئێران لە نێوان ڕێکخراوە چاودێرەکانی دونیا لە ڕووی دژزینەوەی مادده هۆشبەرەکانەوە پلەی یەکەمی بەدەست هێناوە.

بنکەی خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان لە ڕاپۆرتی ساڵی 1998ی خۆیدا، لانیکەمی گیرۆدەبوونەکانی وڵاتی بە ملیۆنێك و 500 هەزار کەس و لانی زۆرەکەشی بە چوار ملیۆن و دووسەد هەزار کەس مەزەندە کردووە کە بەم پێیە، نێوندی کۆمەڵگەی گیرۆدەبوونی وڵات دوو ملیۆن و 574 هەزار کەس بووەو تلیاك بە7.67٪ هیرۆین بە 2.12٪ حەشیش بە 3.7٪ و کێشانی ئەم ماددانەش 8.12٪ ەوە بەرزترین ئاماری مەسرەفکردنی جۆرەکانی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا بووە. چوونە سەری قەبارەی ماددەی هۆشبەری ترانزیتکراو، پەرەسەندنی تۆڕەکانی قاچاخو زیادبوونی ماددەی هۆشبەری چێنراو لە ئەفغانستاندا ، بوونەتە هۆی ئەوەی کە لە ناوخۆی ئێراندا داخوازی و مەسرەفی ئەو ماددانە بچێتە سەرو هەر بەو ڕادەیەش کە دەستبەسەرداگرتنی مادده هۆشبەرەکان لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامییەوە زیاتر ببێ، ڕێژەی گیرۆدەبوون و ئاماری گیرۆدەبووەکان لە ناوخۆی وڵاتیشدا ڕوو لە زیادبوون بکا. بە چەشنێك کە مادده هۆشبەرەکان بە گەورەترین قەیرانی وڵات لە قەڵەم بدرێ و خزمەتی کۆماری ئیسلامی بە ئەورووپیەکان لە خزمەتکردن بە خەڵکی وڵاتەکەی

زیاتر بووە، ئەگەرچی لەم پێناوەدا زیاتر لە 2400 کەس گیانیان بەختکردووە و، ساڵانە زیاتر لە 700 ملیارد تمەن دەکرێتە خەرجی خەبات دژی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان و زیاتر لە چوار هەزار ملیارد قەمران (ریال) لە سەرمایەی دەزگاکانی جێبەجێکردنی وڵاتیش لەم پێناوەدا خەرج دەکرێ. لە ساڵی 1979 تاکو ئێستا زیاتر لە 5000 کەس لە پەیوەندی لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکاندا ئیعدام کراون. هێزو توانای قاچاخچییەکان و ژمارەی گیرۆدەبوونەکان زیادی کردووەو ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکان بۆ دەرەوەی وڵات هەروا بەردەوامە.

ئەوەی ماددە هۆشبەرەکانی کردووە بە قەیرانێکی گەورە، دەگەرێتەوە بۆ هۆکارە جوگرافی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی و کەلتورییەکانی ناوخۆو ناوچەکە، هاوسنووربوونی ئێران لەگەڵ ئەفغانستاندا کە 79٪ی تلیاکی جیهان دابین دەکا، هەڵکەوتنی ئێران لە سەر رێگای ترانزیتی نێونەتەوەیی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان، هەژاری و بێکاری و بوونی تایبەتمەندی دەرمانی لەو ماددەیەدا، هەوراز و نشێوەکانی خەبات لە دژی ماددە هۆشبەرەکان، سەرباری زەبروزەنگ نواندنەکان، هەوڵی دەوڵەتەکان و سەرفکردنی توانای ماددی و مرۆیی، چ تاکەکەسی و چ کۆمەڵایەتی، نەتوانراوە سنوورێك بۆ ماددە هۆشبەرەکان دابنرێ و گیرۆدەبوون و قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان بەردەوام وەك کێشەیەکی چارەهەڵنەگر و هەرەشەیەکی نیشتمانی و قولکردنەوەی قەیران لە ناو نەوەی نوێدا ماوەتەوە. لە سەرجەمی 3 ملیۆن گیرۆدەبوو لە ئێراندا، 260 هەزار کەسیان قوتابی و خوێندکارن. ئەو ماددەهۆشبەرانەی کە لە ئێراندا دەستیان بە سەردا گیراوە لە 11076 کیلۆگرام لە ساڵی 1979دا گەیشتۆتە 188696 کیلۆگرام لە ساڵی 1998دا.

## کۆنترۆلی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان

سیستمی کۆنترۆلی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵێك ڕێکەوتننامەو پەیماننامەدا بەڕێوە دەچێ کە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پەسەند کراوەو بەو پێیە دەوڵەتەکان ناموژگاری دەکرێن کە چاودێری بە سەر بەرهەمهێنان و دابەشکردنی مادده هۆشبەرەکانو دەرمانە نەشئەبەخشەکان بکەن، دژ بە گیرۆدەبوون و قاچاخی مادده هۆشبەرەکان خەبات بکەن و ڕێکخستن و ڕێکخراوی تایبەت بۆ ئەم کارە گرنگە دابمەزرێنن‌و چالاکیەکانی خۆیان بە ئاگاداری نەتەوە یەکگرتووەکان بگەیەنن. نەتەوە یەکگرتوەکان بە مەبەستی یەکخستنی هەوڵە نێونەتەوەییەکان بۆ خەبات دژی قاچاخی مادده هۆشبەرەکان، یارمەتیدان بۆ ڕێگرتن لە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان لە جیهانداو چاودێری و کۆنترۆڵکردنی چاندن، بەرهەمهێنان و دابەشکردنی مادده هۆشبەرەکان بە مەبەستی بەکارهێنانی وەك دەرمان لە وڵاتاندا، بەدواداچوون‌و چاودێری بەسەر جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەو پەیماننامە نێونەتەوەییەکان، چەند ناوەندێکی پێکهێناوە.

## دامەزراوە سەرەکییەکان

### 1- کۆڕی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان

دەزگایەکی یاسادانەری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە. بڕیارنامەکان، پەیماننامەکان‌و پرۆتۆکوڵەکان، بوودجە (میزانییە)و ئیمکاناتی پێویست بۆ خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان و کۆنترۆڵکردنی نێو نەتەوەیی ئەو ماددانە پەسەند دەکاو رایدەگەیەنێ.

### 2- لیژنەی نێونەتەوەیی کۆنترۆڵکردنی مادده هۆشبەرەکان (INCB)

دامەزراوەیەکە بۆ کۆنترۆڵکردن و چاودێری، نیوە قەزاییە و سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکانە کە بۆ چۆنیەتی جێبەجێکردنی ناوەرۆکی پەیاننامەکان و پەیاننامە نێونەتەوەییەکان دامەزراوەو لە لایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە چاودێری دەکرێ و 13 ئەندامی هەیە.

### 3- بەرنامەی کۆنترۆڵی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان (UNDCP)

ئەم رێکخراوە ئەرکی رێنوێنیکردن و کۆنترۆڵکردنی نێونەتەوەی مادده هۆشبەرەکانی لە ئەستۆیە، چاودێری رەوتی بەرهەمهێنان، مەسرەفکردن و قاچاخی مادده هۆشبەرەکان دەکا و بەدوای جێبەجێکردنی پەیاننامە نێونەتەوەییەکانی لەمەڕ کۆنترۆڵکردنی مادده هۆشبەرەکاندا دەچێ و بە ناوەندێکی جیهانی پسپۆڕی و زانیاری بۆ کۆنترۆڵکردنی مادده هۆشبەرەکان لە قەڵەم دەدرێ. هەروەها ئەم رێکخراوە سەرەکییەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەرپرسیارێتی پێکهێنانی هاوکاریو هاوئاهەنگی لە نێوان وڵاتان و رێنوێنی و رێبەریکردنی سەرجەمی چالاکییەکانی رێکخراوی نەتەوەکان لە بواری خەبات دژی مادده هۆشبەرەکانی لە سەرشانە

### 4- کۆمیسیۆنی مادده هۆشبەرەکان

یەکێك لە کۆمیتە لاوەکییەکانی شوورای ئابووری و کۆمەڵایەتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە بەسەر چۆنێتی جێبەجێکردنی بڕیارنامە و پەیاننامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بواری خەبات دژی مادده هۆشبەرەکاندا چاودێری دەکا و دیاری دەکا کە دەرمان یان ماددەیەکی کیمیایی تایبەت بخرێتە پێڕستی مادده کۆنترۆڵکراوەکانەوە، یان بخرێتە نێو پێڕستێکی دیکەوە یان بە تەواوی لە پێرستی هۆشبەرەکان وەلابنرێ.

5- شوورای ئابووری و کۆمەلایەتی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان

ئەم شوورایە خاوەن 54 ئەندامەو یەکێك لە ئەرکە سەرەکییەکانی دیاریکردنی سیاسەتەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان لە بواری کۆنترۆلکردنی بەکارهێنانی زیانبەخشی ماددە هۆشبەرەکاندایە. هەروەها ئەم شوورایە چالاکییەکانی دژ بە ماددە هۆشبەرەکان هاوئاهەنگ دەکات و ڕیزێك بەرنامەی کۆمەلایەتی و ئابووری و ئامۆژگاری پێویست بۆ دەوڵەتەکان ئامادە دەکات.

## ڕێکخراوە لاوەکییەکان

جگە لە ڕێکخراوە سەرەکییەکانی چاودێریو کۆنترۆلکردنی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان، باقی ڕێکخراوو دامەزراوە پاشکۆکانی نەتەوەیەکگرتووەکان هەر کام لە چوارچێوەی کاری خۆیاندا لە بواری چاودێری، هاوئاهەنگیو جێبەجێکردنی کۆنڤانسیۆن نێونەتەوەییەکانی ماددە هۆشبەرەکاندا چالاکن. گرنگترین ئەم ڕێکخراوە لاوەکیانە بریتین لە:

1- ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (W.H.O)

ئەم ڕێکخراوە لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆی و ڕەواجدان بە تەندروستی جیهانی لە پێناو کەمکردنەوەی بەکارهێنانی زیانباری ماددە هۆشبەرەکاندا هەڵدەسوڕێ و بە پێی پەیماننامە نێونەتەوەییەکانی ماددە هۆشبەرەکان دەتوانێ ماددەیەك بخاتە ڕیزی ماددە هۆشبەرەکان، یان وەلای بنێ.

2- ڕێکخراوی پۆلیسی تاوانی نێونەتەوەیی (ئینتەرپۆل)

ئەم ڕێکخراوە بە ئامانجی بەرزکردنەوەی ئاستی هاوکارییە ئەمنی و پۆلیسییەکان لە چوارچێوەی یاسا ناوخۆییەکاندا پێکهاتووەو یەکێك لە ئەرکەکانی، بردنە سەری توانای هێزە کاراکانی هەر وڵاتێك لە پێناو خەبات

دژی مادده هۆشبەرەکان و گۆڕینەوەی زانیاری دەربارەی کەسەکان، باندەکان و تۆڕە نێونەتەوەییەکان‌و ڕێگرتن لە ڕوودانی تاوانی نێونەتەوەیی لەسەر شانە.

## 3- ڕێکخراوی گومرگی جیهانی (W.C.O)

ئەم ڕێکخراوە نێونەتەوەییە لە پاڵ ئەرکەکانی دیکەیدا، لە بواری بەربەرەکانیکردنی قاچاخچییەکان‌و ڕێگریکردن لە قاچاخیشدا چالاکەو تاکو ئێستا گەلێك پرۆژەی هاوبەشی لەگەڵ UNDCP لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەیدا جێبەجێکردووە

## 4- کۆمیسیۆنی گواستنەوەی هەوایی نێونەتەوەیی (ANC)

ئەرکی ئەم کۆمیسیۆنە ئەوەیە کە پێش بە گواستنەوەی نایاسایی مادده هۆشبەرەکان (قاچاخی نێونەتەوەیی) لە ڕێگای هەواوە بگرێ. هەنگاوەکانی ئەم کۆمسیۆنەو هەوڵەکانی ئیکانۆ بووەتە هۆی ئەوەی کە قاچاخی مادده هۆشبەرەکان لە بەشی گواستنەوەی هەواییدا بە تەواوی کۆنترۆڵ بکرێ لە سەرجەمی ماددەهۆشبەرە دۆزراوەکاندا 31٪ی لە لایەن بەشی گواستنەوەی هەواییەوە دەبێ. کارپێکردن بە پێوەرە ئەمنی و کۆنڤانسیۆن نێونەتەوەییەکان لە بەشی گواستنەوەدا یارمەتییەکی گەورە بە خەبات دژی دیاردەی قاچاخی نێو نەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان دەدات.

## ڕێکخراوە لاوەکییەکانی دیکە

5- ناوەندی لێکۆڵینەوە قەزاییەکان‌و تاوانە نێونەتەوەییەکانی سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

6- ڕێکخراوی نێو نەتەوەیی کار (I.L.O) .

7- ڕێکخراوی خۆراك و کشتوکاڵی (F.A.O).

8- ڕێکخراوی پەرەسەندنی پیشەسازی نەتەوە یەکگرتووەکان.

9- ڕێکخراوی زانستی، کەلتووری و فێرکاری نەتەوە یەکگرتووەکان (یونسکۆ).

10- سندووقی منداڵانی نەتەوە یەکگرتووەکان (یونسیف).

11- بەشی پێشگیری لە تاوان و جینایەتی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان.

## کۆ هەنگاوی جیهانی دژی مادده هۆشبەرەکان

بەرفراوانی و بەربڵاوبوونی مادده هۆشبەرەکان، بۆتە هۆی ئەوەی کە لە ئاستی نێونەتەوەییدا وەك کێشەیەکی جیهانی چاوی لێبکرێ.

زیاتر لە یەك سەدەیە کە ئەم بابەتە بۆتە جێی سەرنجی دەوڵەتەکان، کۆڕ و کۆبوونەوەو ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان. ئەو پەیماننامە نێونەتەوەییانەی کە چاودێری مادده هۆشبەرەکان و بەرنامەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و بنیادە بەستراوەکان، وڵاتان و دەوڵەتەکان بەرەو خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان و لایەنە جۆراوجۆرەکانی خراپ بەکارهێنان، قاچاخ و گیرۆدەبوون ڕێنوێنی دەکا. بەرنامەی هەنگاوی جیهانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان پەسەندکراوی ساڵی 1990 داوای لە دەوڵەتەکان کردوە کە لە پەیوەندی لەگەڵ خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان و ناسەوارە نێگەتیڤەکانی. زیاتر جددی بن و لە ڕێگای هاوکارییە نێونەتەوەییەکانەوە، تینێك بدەنە بەر خەبات دژی ئەم بەڵام ماڵوێرانکەرە. ئەم بەرنامەیە، ستراتیژو چوارچێوەیەکی گونجاوی بۆ کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی فەراهەم کردووە تا وڵاتان بە هاوکاری یەکترو هاوکاری ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان،

پلان و بەرنامەی نیشتمانی و نێونەتەوەییەکان بخەنە واری جێبەجێکردنەوە، یەکەمین کۆڕی نێونەتەوەیی دژی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان لە (فوریـە)ی 1990دا بە ئامادەبوونی 13 وڵات و یەك لەوان دەوڵەتی ئێـران لـە شـاری شانگهای چیندا دەربارەی تلیاك و ماددە بەدەستهاتووەکانی دیکـەی پێـك هات و لیژنەی نێونەتەوەیی تلیاك دامەزرا. ئەم لیژنەیە توانی لە پەیوەندی لەگەڵ مەترسی بەرهەمهێنان، فرۆشتن و بەکارهێنانی مـاددە هۆشـبەرەکان، هۆشداری بداتە خەڵکی جیهان و ئامۆژگـاری دەوڵەتـەکانی کـردووە کـە لـە چوارچێوەی سنوورەکانی خۆیاندا بـە وردی مـاددە هۆشـبەرەکان بخەنـە ژێـر کۆنترۆڵی خۆیان و وردە وردە پێش بـە مەسـرەفکردنی مـاددە هۆشـبەرەکان بگرن. لە ئاکامی هەوڵی لیژنەی نێونەتەوەیی تلیاك لە کۆبوونەوەی وڵاتـان لـە (ژانویە)ی 1912دا، بەرهەمهێنانی تلیاك خرایـە ژێـر رکێـفـو بـەکارهێنانی ناپزیشکییانەی قەدەغەکراو پەیماننامە نێونەتەوەییەکانی تلیاکیش بەستران.

لە سەر بنەمای پەیماننامەی ئیمـزا کـراو، بەرهـەمهێنان و بڵاوکردنـەوەی مـاددە هۆشـبەرەکان خرایـە ژێـر رکێـف، سـنوورێك بـۆ قاچاخـچییە نێونەتەوەییەکانی ماددە هۆشبەرەکان دانـراو خـستنە ژێـر رکێفـی مـاددە هۆشبەرەکان بوو بە یەکێك لە پرسـەکانی یاسای نێونەتەوەیی.

شەڕی جیهانی یەکەم (1914)، تێکچوونی سیستمی نێونەتەوەیی و زیانەکانی شەڕ، بووە هۆی چوونە سەری بەرهەمهێنان و قاچاخکردنی ماددە هۆشبەرەکان و هەروەها لـە وڵاتـە شـەڕ لێدراوەکانیـشدا ئـەو ماددانـە زیـاتر لـە جاران بەکارهێنران. دوای کۆتـایی هـاتنی شـەڕو دامـەزرانی کۆمەڵـەی نەتـەوەکان (عـصبة الامـم) پـەیمانی کۆمەڵـەی نەتـەوەکان داکـۆکی لـە سـەر هاوکـاری نێونەتەوەیی بۆ خـەبات دژی مـاددە هۆشـبەرەکان کـردو لـە سـاڵی 1921دا کۆمیتەیـەکی بـۆ لێکۆڵینـەوەکردن لـە سـەر قاچـاخی تلیـاك و مـاددە هۆشبەرەکانی دیکە دیاری کرد کە بەناوی کۆمیتەی راوێژکاری تلیاك ناسرا.

راپۆرتەکانی ئەم کۆمیتەیە باس لەوە دەکەن کە بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە جیهاندا رۆژ لە رۆژ زیاتر بووەو قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان کۆنترۆڵ نەکراو لە ساڵی 1924دا کۆنفرانسی نێونەتەوەیی لە پەیوەندی لەگەڵ ماددە هۆشبەرەکاندا بە بەشداری نوێنەرانی 36 وڵات لە ژنێڤدا بەڕێوەچوو خەبات دژی قاچاخچییە نێونەتەوەییەکان خرایە دەستوری کارو سیستەمێکی نێونەتەوەیی بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر بەرهەمهێنان، هەناردنو هاوردنی ماددە هۆشبەرەکان دیاری کرا. ساڵی 1931 کۆنفرانسێکی دیکە لە ژنێڤدا بەسترا و بە ئامادەبوونی 54 وڵات و یەك لەوان ئێران، پەیماننامەیەك بۆ سنووردارکردن، بەرهەمهێنانو کۆنترۆڵی بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان، پەسەندکرا. ئەم پەیماننامەیە وێڕای گرنگیدان بە هاوکاری نێونەتەوەیی بۆ خەبات دژی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان، دەوڵەتانی ئەرکدارکردووە کە ئامار و زانیاری و پێویستی ساڵانەی خۆیان بە ماددە هۆشبەرەکان بخەملێنن و بیدەنەوە بنیادی چاودێری ماددە هۆشبەرەکان و تا رادەی (پێویستی) هەر وڵاتێك دیاری بکرێ. دەوڵەتان راسپێردران بە مەبەستی جێبەجێکردنی پەیماننامەکە کە دەزگایەك بۆ خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان دابمەزرێنن. لە ساڵی 1936دا پەیماننامەیەکی سەرکوتی قاچاخی نایاسایی ماددە مەترسیدارەکان ناوزەدکراو وڵاتەکانی راسپارد کە دژ بە تاوانی قاچاخکردنی ماددە هۆشبەرەکان هەنگاوهەڵگرن و قاچاخچییەکان دەستگیر بکەن و بیدەنەوە بە یەکترو سزای توندیان بە سەردا بسەپێنن و پۆلیسێکی ناوەندی تایبەت بە راگەیشتن بە مەسەلەی ماددە هۆشبەرەکان دابمەزرێنن.

دوای شەڕی جیهانی دووەم و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵی نەتەوەکان، رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان هەندێ هەوڵی لە پێناو کۆنترۆڵکردنی

ماددە هۆشبەرەکان خستە گەڕ[1]. ناکامی ئەم هەوڵە نێونەتەوەییانە بریتی بوو لە دامەزراندنی کۆمەڵی نەتەوەکان، ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و پێشکەشکردنی پرۆتۆکۆل بە وڵاتان بە مەبەستی پاوانکردنی بازرگانی تلیاك (هەناردن‌و هاوردن). بەکارهێنانی تلیاك تەنیا تایبەت نەکرا بە بواری پزیشکی و زانستی، -بەڵکو گیرۆدەبوونەکان دەیانتوانی بە پێی مۆڵەت تلیاك بکێشن.

لە ساڵی 1961دا ژمارەیەك لە وڵاتان بە ئامانجی کۆکردنەوەی دەرەنجامی باسەکانی کۆنفرانسەکان، پەیماننامەکان‌و پرۆتۆکۆڵەکانی ڕابردوو، چەند کۆبوونەوەیەکیان گرێدا کە پەیماننامەیەکی تایبەت بە ماددە هۆشبەرەکانی لێکەوتەوەو بە مەبەستی ئاسانکاریکردن، لیژنەی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان پێکهات. لە ساڵی 1971 دا پەیماننامەی ماددە سەرخۆشکەرەکان لە ڤییەندا ئیمزا کراو ئەو ماددەهۆشبەرە نوێیانەشی گرتە خۆ کە لە جیهاندا بەکار دەهێنراو لە ژێر چاودێری پەیماننامەی 1961 دا نەبوو. لە ساڵی 1988دا پەیماننامەیەك دژی قاچاخی نایاسایی ماددەهۆشبەر و سەرخۆشکەرەکان پەسەند کرا کە بە دوایین پەیماننامەی ماددە هۆشبەرەکان‌و تاوانی نیشتمانی و هاوکاری و بەشداری نێو نەتەوەیی لە قەڵەم دەدرێ[2].

---

1- لە ساڵی 1964دا شووڕای ئابووری کۆمەڵایەتی کۆمیسیۆنی ماددەهۆشبەرەکانی پێکهێنا و لە ساڵی 1948دا کۆڕی گشتی ڕێکخراوی نەتەوەکان بە پەسەندکردنی پرۆتۆکۆلێك چاودێریکردنی ماددەهۆشبەرەکانی بەردەستدا و ئەو ماددانەشی گرتەوە کە لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانییەوە دیاری دەکرێن.

2- تا کۆتایی ساڵی 1996 بیست وڵات لە سەرجەمی 24 وڵاتی ئاسیایی لە دەرەوەی پەیماننامەی 1961دا، 18 وڵات ئەندامی پەیماننامەی 1971و 19 وڵات چوونە نێو پەیماننامەی 1988 وەو وڵاتانی ئەفغانستان‌و گورجستان(جورجیا)ئەندامی هیچ یەك لە پەیماننامە نێو نەتەوەییەکان نین.

ئەمڕۆکە سەرجەمی وڵاتانی جیهان بە کێشەی ماددە هۆشبەرەکانەوە تووش بوون و دەرەنجام و کاریگەرییە خراپەکانی ئەم دیاردە مەترسیدارە کارێکی وای کردووە کە دەوڵەتان بە پێی هەلومەرج و باروودۆخی خۆیان، لەگەڵ پەیماننامە نێونەتەوەییەکاندا هاوهەنگاوبن و بەرنامەی کۆنترۆڵکردنی بڵاوکردنەوە و داخوازی ماددە هۆشبەرەکان، خراپ بەکارهێنان و خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان بخەنە بەرنامەی کاری خۆیانەوە. هەر وڵاتێک بنیاد و ڕێکخراوی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان دابمەزرێنن و کار و بارە پەیوەندیدارەکان بخرێتە چوارچێوەی پەیماننامەکان و بە سەرنجدان بە یاسای ناوخۆیی و سێنتراڵ جێبەجێ بکرێ. سەرباری ئەمو هەوڵانەی دراون، گرنگترین کێشەی وڵاتانی جیهان لە ئاستی نیشتمانیدا، چوونە سەری داخوازی بۆ بەکارهێنانی نایاسایی ماددە هۆشبەرەکان و قاچاخی نێونەتەوەیی ئەو ماددانەیە.

قاچاخی نێو نەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان، تاوانی نێونەتەوەیی بە تاوتوێکردنی تاوانە نێونەتەوەییەکان دەتوانین ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە وەک توخمی پێکهێنەری تاوانی نێونەتەوەیی لە قەڵەم بدەین:

أ- توخمی نێونەتەوەیی
ب- توخمی فرە نەتەوەیی
ج- توخمی دەوڵەت

دەتوانین هەرسێ تایبەتمەندییەکەی سەرەوە لە بابەتی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکاندا بەدی بکەین. قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان تاوانێکی سیستماتی فرە نەتەوەییە. جۆرەکانی ئەم تاوانە لە ئاستی نێونەتەوەییدا هەڕەشەیە بۆ سەر تەندروستی ئینسانەکان، فەرمانڕەوایی وڵاتان و

**ئاسایشی جیهانی و پرنسیپەکان و رێوشوێنە نێونەتەوەییەکانیش پێشێل دەکا. مەبەست لە توخمی نێونەتەوەیی، ئەنجامدانی کردار یان وازهێنان لە کردارێکە کە راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی دەکاو ئەنجامدانی ئەو کردارە ویژدانی مرۆڤایەتی بریندار دەکا و میتانەتەوەییبوونی تاوانی نێونەتەوەیی مانای ئەوەیە کە کرداری تاوانکارانە کاریگەری لە سەر بەرژەوەندی و ئاسایشی زیاتر لە وڵاتێک دادەنێ، واتە کرداری تاوانکارانە سنووری نەتەوەیی وڵاتێک تێدەپەڕێنێ، یان دانیشتوانی زیاتر لە وڵاتێک دەگرێتەوە. مەبەست لە دەستێوەردانی توخمی دەوڵەت لە تاوانی نێونەتەوەییدا ئەمەیە کە تاوان بەو تایبەتمەندییانەوە کە باسکران لە لایەن بەشێك لە سیاسەت یان بیرکردنەوەی دەوڵەت، نوێنەرانی دەوڵەتەکان و فەرمانبەرانی دەوڵەتەوە ئەنجام دەدرێ. (تاوانە نێونەتەوەییەکان بریتییە لەو کردەوە نایاساییانەی کە پەیمانێکی گرنگ و بنچینەیی پێشێل دەکەن کە لە روانگەی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگەی جیهانییەوە گرنگی بنچینەیی هەیە).**

**قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان یەکێکە لەو تاوانانەی کە لە مەیدانی نێونەتەوەییدا رووددەداو هەڕەشەیە بۆ سەر تەندروستی ئینسانەکان، دەسەڵاتداریێتی وڵاتان و ئاسایشی کۆمەڵگەی جیهانی و، بنەماکان و رێوشوێنە نێونەتەوەیەکان پێشێل دەکا[1]. جگە لەمانە ئەم کردەوە تاوانکارانە هەڕەشە لە بنیادە سەرەکییەکانی کۆمەڵگە وەك ئابووری، کۆمەڵایەتی، کەلتوری، سیاسیو بنەماڵە دەکاو زیان بە**

---

1- ئەو پەیماننامە نیونەتەوەییانەی کە لە ساڵەکانی 1961، 1971و 1988دا لە سەر ماددە هۆشبەرەکان پەسند کراون زۆربەی وڵاتانی جیهان پێیانەوە پەیوەست بوون، بە بەڵێننامەی نیونەتەوەییو سەرچاوەی یاسای نیونەتەوەیی لەقەڵەم دەدرێ.

بەرژەوەندییە نەتەوەیی و ناوچەییەکان دەگەیەنێ، دانیشتوانی زیاتر لە وڵاتێك دەگرێتەوە و هەڵگری توخمی میتانەتەوەیی.

دەستەوەستانی یەك یان چەند دەوڵەت لە رووبەرووبوونەوە لەگەڵ ئەم دیاردە سیستماتییەدا و ترس و نیگەرانی وڵاتان و کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی کە لە پێشەکی پەیماننامەکاندا باسکراوە، دەتوانین وەك بەڵگەیەکی نێونەتەوەیی بوونی تاوانی قاچاخی ماددەهۆشبەرەکان چاوی لێبکەین.

## گرووپە سیستماتییەکان و قاچاخی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان

کاتێ باس لە گرووپی سیستماتی دەکەین، تاوانی سیستماتیش دێتە نێو زەینمان. قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکانیش تاوانێکی میتانەتەوەیی سیستماتییە کە لە لایەن باندو گرووپە سیستماتیەکانەوە بە پێی زنجیرە پلەی هێز، نیمکانات و کەرەستەوە سنووری وڵاتان دەبەزێنن، سەروەری خاکی دەوڵەتەکان پێشێل دەکەنو لە رێگای گواستنەوە لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەندێ تاوانی دیکەی وەك فرۆکە رفاندن، تیرۆرو کوشتن، لە ناوبردنی ژینگە، قاچاخی چەك و تەقەمەنی.. هتدیش بە دوای خۆیدا دێنێ.

تاوانی سیستماتی بەو کردەوە تاوانکارانە دەوترێ کە لە لایەن باندو گرووپی یەکگرتوو و رێکخراوەوە ئەنجام دەدرێ و مەبەستیان بەدەستهێنانی سوودو قازانجی ماددییە. گرووپی سیستماتیش بریتییە لە کۆی هێز و توانا و دەسەڵاتی ماددی سیستماتی بۆ چالاکی تاوانکارانە. هەر کاتێك تاوانی سیستماتی مۆرکی میتانەتەوەیی بە خۆوە بگرێ، دەبێتە هەرەشەیەك بۆ سەر ئاسایشی نێونەتەوەیی و قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان کە لە لایەن

گرووپ و باندە سیستماتیەکانەوە ئەنجام دەدرێ، مۆرکی میتانەتەوەیی پێوەیە و تاوانێکی نێونەتەوەییە[1].

قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان، سەرەکیترین چالاکی باندو گرووپە تاوانکارە نێونەتەوەییەکانە[2]. پرقازانجبوون و کاریگەری ماددە هۆشبەرەکان لە نابووریدا بوّتە هۆی ئەوە کە گرووپە سیستماتییەکان بە پشتبەستن بە کارتێلو رێکخراوە مافیاییەکان و پشتیوانی و رێنوێنی نهێنی دەسەڵاتدارەکان بە ئاسوودەیی لە ئاستی نێونەتەوەییدا بازرگانی بە ماددە هۆشبەرەکانەوە بکەن و لە بەشی ماددە هۆشبەرەکان و دەرمانە سەرخۆشکەرەکاندا ببنە گەورەترین سەرمایەگوزاری نابووری.

کارتێلەکانی مێدلین (Medellin) و کالی لە کۆلۆمبیادا[3]، مافیا لە ئەورووپای رۆژهەڵاتدا، تردیاکان لە ئەورووپا، ئەمریکا و ئاسیادا و گرووپی ماددە هۆشبەرەکانی مۆسکۆ لە ئەفغانستان، لەندەنو لانوس نموونەیەکن لەو کارتێلە بەناوبانگانە کە هۆکاری گواستنەوە و قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکانن، لە بەرهەمهێنان تاکو بلاوکردنەوە لە ئاستی جیهاندا لە ژێر

1- ئەخشەی ئەپراسیۆنی جیهانی بۆ خەبات دژی تاوانە سیستماتییە میتانەتەوەییەکان، یەکێك لە هەنگاوەکانی وەزیرانی ناوخۆ دادگاکانی 142 وڵاتی بەشدار لە کۆنفرانسی نێونەتەوەیی دابوو کە لە رێکەوتی 21 تا 23ی نۆڤێمبەری ساڵی 1994دا پێك هات.
2- ئەم باندو گرووپانە ئامێرە مۆدێرنەکانی وەك کۆمپیوتەر، سەتەلایت، ئامێری هەولگری و پێوەندیگرتن، چەکی قورس و نیوەقورس، فرۆکە، کەشتی، ئوتومبێلی جۆرلوجۆریان لەبەردەستدایەو رێکخراو و رێکخستن و سێنترالیزمی تایبەت بەخۆیان هەیە و لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆیاندا بە شێوەی سیستماتی تاوان ئەنجام دەدەن.
3- بارەگای سەرەکی کارتێلی مێدلین لە شاری مێدلین (Medlellin)لە 150 مایلی رۆژئاوای بوگۆتا (Bogota)پایتەختی وڵاتی کۆلۆمبیادا هەلکەوتووە و بارەگای سەرەکی کارتێلی کالی شاری کالی (Cali)یە کە کەتووەتە 200 مایلی باشووری رۆژئاوای پایتەخت.

کۆنترۆڵ و ڕێبەریکردنی ئەواندایە[1]. لە نێو ڕێکخراوە تاوانکارەکانـدا، مافیـا ناوبانگی جیهانی هەیە و لەسـاڵی 1969 بە دواوە کە زانیبیان قاچاخی جگەرە و تەماکۆ قازانجی کەمتری هەیە، دەستیانکرد بە قاچاخی هیرۆیینو کۆکـایینو کاری دیکـەی وەك بازرگـانی چـەك و تەقەمـەنی و بازرگـانی سێکـسی بـە شێوەیەکی بەربڵاو.

## دەسەڵاتی وڵاتان بۆ لێکۆڵینەوە لە تاوانە نێونەتەوەییەکان

توخمە پێکهێنەرەکانی وڵات (کەسێتی یاسایی نێونەتەوەیی) بریتین لە: سەر زەوی (خـاك)، حەشـیمەت (دانیـشتوان)، دەوڵـەت و فـەرمانڕەوایی. بـە دروستبوونی وڵاتێك لە سـەر زەوییـەکی دیـاریکراودا، ئەگـەر ئـەو توخمـە پێکهێنەرانە هەبن، سەربەخۆیی لـە کـردەوە و فەرمانڕەوایـدا مانـا پەیـدا دەکـا. دەسـەڵات، ڕەهەنـدێکی تایبـەتی فەرمانڕەواییـە و فـەرمانڕەوایی بریتییە لە دەسەڵاتی گشتی و یاسایی دەوڵـەت کـە بـە شـێوەی یاسـا لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ تاکـەکان، مـاڵ و موڵـك و کاروبارەکـانی دیکـەدا بـەکاردەبرێ. ئەگەرچـی گەشـەی خێزانـی تەکنـەلۆژیای پەیوەندییـەکان و زانیارییەکانو سەتەلایتو کۆمپیوتەر وایکردووە کە دەوڵەتەکان نەتوانن بـە ئاسانی لە تاوانە نێونەتەوەییەکان بکۆڵنەوە، بـەڵام دەسـەڵاتی دەوڵەتـەکان لەسەر ئەم کۆڵەکانەی خوارەوە دامەزراوە:

---

1- ئەنجومەنـەکانی تریـا(Triad) لـە چـین و هـونگ کۆنگـدا یـەك لـە گـەورەترین و دەستڕۆیشتووترین ڕێکخراوە تاوانکارەکانن و لە کرداردا هاوشێوەی مافیان و دەستیان لە هەنـدێ لـە ڕاپەڕینـەکانی هـۆنگ کۆنگـدا هەیـە و جگـە لـە کـاری تاوانکارانـە و قاچاخچییەتی، کاری بزرگانی یاساییش ئەنجام دەدەن.

1- **دەسەڵاتی خاك**؛ بە پێی ئەم بنەمایە، لێکۆڵینەوە لە تاوان بە سەرنجدان بە شوێنی ئەنجامدانی هەموو یان بەشێك لە تاوانەکە دەکرێ. لەم جۆرە دەسەڵاتە دا، دەوڵەتەکان دەتوانن لێکۆڵینەوە لە هەموو یان بەشێك لە تاوانەکە بکەن کە لە چوارچێوەی سنوورەکانی ئەواندا ئەنجامدراوە یان ئاسەوارێکی خراپی لە قەڵەمڕەوی ئەواندا بەجێهێشتووە. بنەمای دەسەڵاتی خاك، بنەمایەکی پەسەندکراوی نێونەتەوەییە.

2- **بنەمای دەسەڵاتی جیهانی**؛ بە پێی ئەم بنەمایە، دەوڵەتەکان مافی ئەوەیان هەیە کە لە قەڵەمڕەوی خۆیاندا دوای هەندێ لە تاوانباران بکەون، بێئەوەی گوێ بەوە بدەن کە تاوانەکە لە کوێ ئەنجام دراوە و تاوانبار یان قوربانییەکە خەڵکی چ وڵاتێکە. چونکە گریمانە ئەوەیە کە ئەم جۆرە تاوانە دژ بە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی لەقەڵەم دەدرێ. ئەمە بنەمایەکی ئاوارتەیە لە بنەمای دەسەڵاتی خاکدا و ئامانجی ئەوەیە کە تاوانە نێونەتەوەییەکان، بێ سزادان نەمێننەوە[1]. قاچاخی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان یەکێکە لەو تاوانە نێونەتەوەییانە کە دەسەڵاتی گشتی جیهانی دەیگرێتەوە، بەڵام چونکە مادده هۆشبەرەکان جۆراوجۆرن، لەوەدا کە دەسەڵاتی جیهانی کام یەك لەوانە دەگرێتەوە، تەم ومژ و ناڕوونی هەیە.

3- **بنەمای دەسەڵاتی جیهانی**؛ بە پێی ئەم بنەمایە، هەر دەوڵەتێك مافی ئەوەی هەیە کە لە ئاست هەر تاوانێکدا کە دژ بە ئاسایش و سەروەری و بەرژەوەندییەکانی ئەنجام دەدرێ، دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێ

---

1- تاوانە نێو نەتەوەییەکان بریتین لە: دزیی دەریایی، تاوانەکانی شەڕ، کۆمەڵکوژی، نەژادپەرستی، فڕۆکە رفاندن، بارمتەگیری، تیرۆریزم، دزینی ماددەی ناوەکی (هەستەیی)، دەستدرێژیکردنە سەرخاك و..

و دەتوانێ لە قەڵەمڕەوی خۆیدا دژ بەو تاوانانە بجولێتەوە کە لە دەرەوەی سنوورەکانیدا لە هەر لایەکیەوە زیانی پێ دەگەیەنن[1].

لە دەستووری ئێرانیشدا، هەر ئێرانییەك یان بیانییەك کە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی فەرمانڕەوایدایە، هەر تاوانێکی وەك زیان گەیاندن بە کۆماری ئیسلامی ئێران، دروستکردنی پارەی ساختەو هتد....، ئەنجام بدات لە دادگاکانی ئێراندا لێی دەکۆڵرێتەوە[2].

## لایەنەکانی قەدەغەبوون و خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان

هەروەك باسمان کرد، خاڵی هاوبەشی ماددە هۆشبەرەکانو دەرمانە سەرخۆشکەرەکان ئەوەیە کە دەکرێ خراپ بەکاربهێنرێن و کاریگەرییەکی زۆر خراپ لەسەر دەمارەکان و رەفتاری کەسەکە دادەنێن.

سەرباری ئەوەی کە یاسا چاندنی ماددە هۆشبەرەکانی قەدەغەکردووە، بڵاوکردنەوە و کێشانی ماددە هۆشبەرەکان و بەربەرەکانیکردن لەگەڵ بەرهەمهێنان، بڵاوکردنەوەو خراپ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان و هەنگاوی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی دژی ئەم دیاردەیە و دژایەتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ گیرۆدەبوون، خراپ بەکارهێنان، بڵاوکردنەوە و داخوازی بۆ ماددە هۆشبەرەکان چۆتە سەر. لایەنگرانی قەدەغەکردنیی ئازادی لە کێشانی ماددە هۆشبەرەکان دەبێتە هۆی چوونە سەری بەکارهێنان و مەیلی

1- یاسای زۆرێك لە وڵاتە ئەوروپییەکان بۆ وێنە فرەنسا، ئەڵمانیاو ئەمریکا دەسەڵاتی دادگاکانی ئەم وڵاتانەیان بۆ لێکۆڵینەوە لەو تاوانانەی کە لە دەرەوە ئەنجام دەدرێن بەڵام زیان بە بەرژەوەندی ئەم وڵاتانە دەگەیەنن، بە رەسمییەت ناسیوە.

2- مادەی (5) ی یاسای سزادانی ئیسلامی، پەسندکراوی ساڵی 1991.

تاکەکانی کۆمەلگە بۆ چێژ لێوەرگرتن و کەیفخۆشی بە یەکەم هەنگاوی گیرۆدەبوون دادەنێن. کاریگەرییە کەسی و کۆمەڵایەتییەکانی گیرۆدەبوون لە ناوخۆی ولات و کاریگەری قاچاخی نێونەتەوەیی ئەو ماددەیە لە سەر فەرمانڕەوایی و ئاسایشی وڵاتان، بۆتە هەوێنی ئەوەی کە کۆمەلگەی جیهانی و دەولەتەکان لە پێناو تەحریمکردن و قەدەغەکردنی چاندن، بەرهەمهێنان، کێشان و قاچاخی ماددە هۆشبەرەکاندا هەنگاو هەلگرن. وێڕای قەدەغەکردنی بلاوکردنەوە، چەند هەولێکیش بۆ کەمکردنەوەی داخوازی بۆ کێشانی ماددە هۆشبەرەکان ئەنجام دراوە. فێرکردنی گشتی، ڕێگرتن، چارەسەرکردن و پەروەردەکردنەوەی گیرۆدەبووەکان نموونەیەکن لەو کارانەی کە لە پێناو کەمکردنی داخوازی بۆ کێشانی ماددە هۆشبەرەکاندا ئەنجام دراون. سەرباری هەنگاوە نێونەتەوەییەکان و هەولە نەتەوەییەکان، پرۆژەی قەدەغەکردنی ماددە هۆشبەرەکان بە ئامانجی کەمکردنی داخوازی و خەبات دژی گیرۆدەبوون نەیتوانیوە سەرکەوتوو بێت. سنووردارکردن و قەدەغەکردن، جیبەجێکردنی یاساکان و خەبات دژی بلاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان، نەك هەر نەبووەتە هۆی کەمکردنی داخوازی، بەلکو ڕێژەی بلاوکردنەوەی لە رووی نرخ و داخوازی بۆ کێشانی ماددە هۆشبەرەکان بردۆتە سەر.

بە گشتی، ناچاربوونی تاکەکان بۆ ڕێزدانان و رەچاوکردنی یاسا لە کۆمەلگادا کاراییەکی جێی متمانەی نییە، ئێمە لە ناو کۆمەلگادا رۆژانە شاهیدی چەندین لادان و پێشێلکاری یاسا و ڕێساکانین. خۆدزینەوەی خەلك لە دانی باج، رەچاونەکردنی یاساکانی هاتوچۆو هتد...، نموونەیەکی لەو چەشنەن. هەنگاوی یاسایی دژ بە ماددە هۆشبەرەکانیش هەر لەم چوارچێوەیە بەدەر نییە، بۆیە پێویستە بۆ چارەسەرکردنی ئەم جۆرە کێشان، کاری کەلتووری و پەروەردەیی ئەولەویەتی پێ بدرێ. زیانە کەسی و

کۆمەڵایەتییەکانی کێشانی ماددە هۆشبەرەکان، کۆمەڵگەی جیهانی و دەوڵەتەکانی وا لێکردووە کە یاسا و ڕێسای تایبەت بە سنووردارکردنی ماددە هۆشبەرەکان پەسند بکەن، بەڵام باجی یاسایی و هەزینەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان زیاتر بووە لە تێچووی کێشانی ماددە هۆشبەرەکان و ئەو هەنگاوانەی لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا نراوان کاریگەر نەبوون، چونکە:

1- کێشانی ماددە هۆشبەرەکان جۆرە چێژوەرگرتن و کەیفخۆشییەک بە دوای خۆیدا دەهێنێ و لایەنی دەرمانییەکەی نارامبەخش و کاریگەرە. کە دەڵێن حەزی کەسەکان بۆ چێژلێوەرگرتن بە یەکەم هەنگاوی گیرۆدەیی لە قەڵەم دەدرێ، هەر لە بەر ئەم هۆیەیە.

2- لە رووی کەلتوورییەوە، داب و نەریتی کۆمەڵگا پێشوازی لە تەحریمی ماددە هۆشبەرەکان نەکردووە و لە وڵاتانی ئیسلامیشدا کێشانی حەرام نەکراوە وەك خواردنەوەکانیش کۆدەنگییەك لەسەر ناشەرعیکردنی لە ئارادا نییە.

3- بەرهەمهێنان، کڕین و فرۆشتن و کێشانی ماددە هۆشبەرەکان لە چوارچێوەی پەیماننامە نێونەتەوەییەکان و یاسای ناوخۆیی وڵاتاندا جێبەجێ دەکرێ و لە نێوان بەکارهێنانی ئیزندراو و ئیزننەدراودا سنوورێك هەیەو هەر ئەمەش بووەتە هۆکاری چوونەسەری داخوازی و کاریگەری نارامکەرەوەی ماددە هۆشبەرەکان و بە مەیلی (خەڵك) بۆ چێژلێوەرگرتن.

## دیاردەکانی دیکەی قەدەغەکردن و خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان

1- تێکهەڵچوونی توند و چەکدارانەی نێوان قاچاخچییەکان و هێزەکانی ئاسایش و دەوڵەتەکان.

2- کوشت و بڕ تاڵانکردن لە نێوان تۆڕە تاوانکارەکان و قاچاخچییەکانی ماددە هۆشبەرەکاندا.

3- گەورەکردنەوەی سیمای تاوانبارەکان لە لایەن میدیاکان و بە قارەمانکردنی قاچاخچییەکان.

4- توندوتیژی لە بازرگانیکردن بە ماددە هۆشبەرەکان و بازرگانی چەکدارانە وێڕای کوشتن و پیاوکوژی.

5- چوونەسەری تێچووی دابینکردنی پێویستی کەمە گیرۆدەکان و سەرەنجام، دزیکردن، قۆڵبڕین، لەشفرۆشی و ئەنجامدانە تاوانی دیکە لە پێناو دابینکردنی خەرجی ماددە هۆشبەرەکاندا.

6- ڕێنوێنیکردنی گیرۆدەکان بۆ بەکارهێنانی ماددەی دیکە کە گەلێك زیانبارتر و مەترسیدارترن.

7- دیاردە و دەرەنجامەکانی شاردنەوەی گیرۆدەیی(گیرۆدەبوون) بە ماددە هۆشبەرەکان لە ناو بنەماڵەدا.

8- چوونە سەری تێچووەکانی دەرمانکردن و سەردانی کەمەکان بۆ ناوەندە دەرمانییەکان (ژەهراویبوون، تووشبوون بە نەخۆشییەکانی دیکەی وەك ئایدزو...).

## ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکان

قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان بۆ هەندێ لە دەوڵەتەکان قازانجێکی ئابووری و بازرگانی زۆری هەیە. جگە لە لایەنە سیاسی-کۆمەڵایەتیەکانی ماددە هۆشبەرەکان، یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی

سەرنەکەوتنی کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی بۆ چارەکردنی کێشەی ماددە هۆشبەرەکان، دەگەڕێتەوە سەر قازانجی سیاسی و ئابووری هەندێ لەو دەوڵەتانەی کە ماددە هۆشبەرەکان بڵاو و دابەش دەکەن و بوونەتە وڵاتی ترانزیت کە سەرباری ناکامە تاڵەکانی، تاکو ئێستا دەستیان لە بازرگانی پڕ قازانجی ماددە هۆشبەرەکان هەڵنەگرتووە. دووربوونی ناوەندەکانی بەرهەمهێنان لە بازاڕەکانی کڕین و فرۆشتن، پڕ داهاتبوونی بازرگانی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان، لاوازبوونی ئابووری وڵاتانی سەر ڕێگای ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکان و وڵاتانی کڕیار، کێبڕکێ و قازانجی کارتیلەکان، ڕێکخراوەکان و تۆڕەتاوانکارە نێونەتەوەییەکان، بەشداری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەندێ لە دەوڵەتەکان و هۆکارەکانی دیکە، ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکانی ئاسان کردووە و جۆرەکانی ماددە هۆشبەرەکان بە شێوەی نایاسایی دەگوێزرێتەوە بۆ وڵاتانی کڕیار و لەوێ بڵاودەکرێنەوە.

قاچاخچییە نێونەتەوەییەکان (بەپشتبەستن) بە ئامێری پێشکەوتوو و ئامراز و کەرەستەی جەنگی و ڕێکخراوەیی و بە کەڵکوەرگرتن لە لاوازی هێزە سەربازی و ئاسایش و سنوورپارێزەکان، لە قەڵەمڕەوی وڵاتانەوە ماددە هۆشبەرەکان بۆ ئەورووپا و ئەمریکا ترانزیت دەکەن. هەندێکجار ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکان بە ئاشکرا دەکرێ و بە دەم چەورکردنی هێزە دەوڵەتییەکان و ڕەنگیشە بە هەماهەنگی نهێنی لەگەڵ بەرپرسانی دەوڵەت و هاوبەشی هەندێ لە دەوڵەتەکان لەگەڵ تۆڕەکانی قاچاخدا ئەنجام دەدرێ و هەندێکجار بە نهێنی و لە ژێرناوی کاڵای بازرگانی و بەستەی ستانداردا دەگوێزرێتەوە. ماددە هۆشبەرەکان کە لە خاکی ئێرانەوە بۆ تورکیا و لەوێشەوە بۆ بولگاریا و مەکدۆنیا و ئەلبانیا دەگوێزرێتەوە. تلیاک و هیرۆیینی ترانزیتکراو بۆ ئیتالیا و مەکدۆنیا و بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوا دەبرێ

و باره حەشیشیش بۆ بازارەکانی یۆنان و ئیتالیا دەنێردرێ. ترانزیت، مەسەلەیەکی گرنگە لە قاچاخی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکاندا کە لەگەڵ تۆڕە بەربڵاو و سیستماتی و شاراوەکاندا، مادده هۆشبەرەکان دەگوێزنەوە. ئەم تۆڕانە لەلایەن باندە تاوانکارە نێونەتەوەییەکانەوە هەندێ لە دەوڵەتەکان و بەرپرسە ناوچەییەکان و کۆمپانیاکانی دەرمانەوە ڕێکدەخرێن. گرەنتیکردنی لایەنی ئەمنی و ترانزیتی ماددەکان بە هۆی گرووپی سیستماتییەوە ئەنجام دەدرێ و مادده هۆشبەرەکان لە وڵاتانی بەرهەمهێن و وڵاتانی ترانزیتکەری سەرە ڕێگاوە بە ئاسانی دەگوێزرێنەوە بۆ بازارەکانی ئەورووپا، ئەمریکا و ئەفریقیا. لە ئاسیادا، ئەفغانستان و پاکستان گرنگترین ناوەندەکانی بەرهەمهێنەری مادده هۆشبەرەکانن. ئەو ماددانەی لەم ناوچەیەدا بەرهەمدەهێنرێن، زیاتر لە چوار هەزار تەنە، کە بەشی گەورەی لە ڕێگای کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە بە شێوەی ترانزیت بەرەو ئەمریکاو ئەورووپا دەڕوات، لە بەرئەوەی کە ئێران لە ڕووی هەلکەوتی جوگرافیاییەوە کەوتۆتە ناوچەی کەوانەی زێڕین، بەسەرنجدان بە مەترسییەکانی گواستنەوەی هەوایی و دەریایی، کورترین مەودای گواستنەوەی مادده هۆشبەرەکانە بۆ ئەورووپا و مەسەلەی ترانزیتی مادده هۆشبەرەکان لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی وڵاتەوە بەردەوام یەکێك لە کێشە ئەمنییەکان بووەو، بە هۆکاری سەرەکی کێشانی مادده هۆشبەرەکان و گیرۆدەیی (اعتیاد) لە ناوخۆی وڵاتدا لە قەڵەم دەدرێ. ڕەوشی مادده هۆشبەرەکان لە ناوچەکە و هەلکەوتی ستراتیژی ترانزیتی ئێران بە جۆرێکە کە ئەگەر یەك ساڵ خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان لە ئێراندا ڕابوەستێ، ئەوەندەی چوار ساڵ ماددەی هۆشبەری پێویستی بازارەکانی بەریتانیا، فەرەنسا و ئیتالیا لە ڕێگای ئێرانەوە دەگاتە ئەورووپا. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی کە بەرنامەی کۆنترۆلکردنی مادده هۆشبەرەکانی سەر بە ڕێکخراوی

نەتەوەیەکگرتووەکان (UNDCP) نووسینگەیەکی لە ئێراندا کردۆتەوە و پرۆژەیەکی یارمەتی 13 ملیۆن دۆلاری ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانی بۆ بەهێزکردنی توانای ئێران لە خەبات دژی ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکان دەستپێکردووە.

**گرنگترین ئاستەنگەکانی بەردەم ڕێگای ئێران لە خەبات دژی ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکاندا چاندنی بەربڵاوو بەرهەمهێنانی بەرفراوانی ماددە هۆشبەرەکان لە ئەفغانستاندا.**

1- بەربڵاوبوونی سنووری ئێران لەگەڵ پاکستان و ئەفغانستان و دراوسێکانی دیکەدا.

2- خەرج هەڵگربوونی خەبات بە تایبەت لە جێبەجێکردنی پرۆژەی داخستن، قایمکردن و کۆنترۆلکردنی سنوورەکاندا.

3- بوونی هاوبەشی نەتەوەیی، کەلتووری و خزمایەتی نێوان (دانیشتوانی) ئەم دیو و ئەودیوی سنوورەڕۆژهەڵاتییەکان.

4- هەلومەرجی نابووری و بارودۆخی ژیان و گوزەرانی دانیشتوانی سەر سنوور لە ڕۆژهەڵاتی وڵاتدا.

5- قاچاخچییە نێونەتەوەیی و ناوچەییەکان و پرقازانجبوونی بازرگانی ماددە هۆشبەرەکان.

6- حاشاهەڵنەگربوونی گواستنەوەی ماددەهۆشبەرە بەرهەمهێنراوەکان لە ئەفغانستان بەرەو ناوچەکانی دیکەی جیهان کە لە ساڵدا دەکاتە زیاتر لە 400 تەن.

7- بازاڕی پڕداهاتی ماددە هۆشبەرەکان لە وڵاتە ئەورووپی، ئەمریکی و ئەفریقییەکاندا.

8- نزیکبوون لە ناوەندە بازرگانییە ناوچەییەکانی دوبەی، بەحرێن و مەسەلەی دروستکردنی پارەی ساختە.

9- لەرادەبەدەربوونی ماددە هۆشبەرەکان لە ناوخۆی ولآتدا، چوونەسەری ناستی بلآوکردنەوەو داخوازی بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان.

10- زیانە کەسی و کۆمەلآیەتییەکانی خەبات دژی ترانزیتی ماددە هۆشبەرەکان.

## پێویستیی هاوکاری نێونەتەوەیی دژی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان

دیرۆکی هاوکارییە نێونەتەوەییەکان و رەوتی گەشەکردنی ئەو هاوکارییانە لە دژی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان لە سالّی 1909 تاکو ئێستا ئەو راستیە دەسەلمێنن کە ماددە هۆشبەرەکان زیانی بەهەموو ولآتان، چ ولآتانی پێشکەوتوو و چ ولآتانی روو لە پەرەسەندن گەیاندووە. هەرەشەکردن لە فەرمانڕەوایی و ئاسایشی ولآتان، هەرەشەکردن لە دەزگا سەرەکییەکانی ولآتانو بە سیستماتیبوونی قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان بەشێکن لەو هۆکار و خالّە هاوبەشانە کە ولآتانی والێکردووە دژ بەم پەتا جیهانییە هاوکاری یەکتر بکەن.

ئێستا رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و دەولّەتەکان بە مەبەستی کەمکردنەوە و کۆنترۆلّکردن و خەبات دژی کێشان و قاچاخکردنی ماددە هۆشبەرەکان بەرنامەیەکی کاریان بۆ خۆیان داناوە. بە جیهانیبوونی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان رێگایەکی دیکەی جگە لە هاوکاری نێونەتەوەیی بۆ دژایەتیکردن نەهێشتۆتەوە و لەبەرئەوە ولآتان ناتوانن لە ناستی نیشتمانیدا بەرامبەر بەم دیاردەیە بوەستن، لەبەرئەوەی کە باندە سیستماتییەکانو قاچاخچییە نێونەتەوەییەکان بە کەلکوەرگرتن لە

پێشکەوتووترین ئامرازەکانی پەیوەندیگرتن و گواستنەوە و گەیاندن خۆیان خزاندۆتە ناو وڵاتەکان و بۆ ترانزێتکردن و قاچاخی مادده هۆشبەرەکان و پەیوەندیگرتن لەگەڵ قاچاخچییەکان لە ئاستی نێونەتەوەیدا کەڵك لە شێوازەکانی کاری پۆلیسی بۆ بەدەستهێنانی زانیاریو کاری نهێنی وەردەگرن، وڵاتان دەستەویەخەی کێشەیەکی لە چارەنەهاتوون کە یەکلاییکردنەوەی ئەم کێشەیە تەنیا بە ڕێگای ئیرادەیەکی نێونەتەوەیی، ستراتیژییەکی یەکگرتووی جیهانی و هەماهەنگی و هاوسانی یاسا نەتەوەییەکانەوە جێبەجێدەبێ.

لە لایەکی دیکەشەوە، هەڕەشە بۆ سەر ئاسایش و فەرمانڕەوایی وڵاتەکان، پێشێلکردنی یاسا و ڕێساکان و پەیماننامە نێونەتەوەییەکان، ئەو پێویستیە دێنێتە گۆڕێ کە دەوڵەت و ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان بە شێوەی یەکگرتوو و هاوئاهەنگ دژایەتیکردنی تاوانە نێونەتەوەییەکانی مادده هۆشبەرەکان بخەنە بەرنامەی کاری خۆیانەوە. چونکە قاچاخکردن و ترانزێتی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان، جۆرە دەستتێوەردانێکە لە کاروباری ناوخۆی وڵاتان و سەروەری وڵات پێشێل دەکا، لە ڕووی ڕێکەوتنە نێونەتەوەییەکانەوە بە کارێکی تاوانکارانە لە قەڵەم دەدرێ و پەیوەندی بە سیستمی یاساییەك یان چەند وڵاتەوە هەیە، سەرباری ئەوەی کە فرەنەتەوەیبوونی ترانزێت و قاچاخی مادده هۆشبەرەکان فەرمانڕەوایی و ئاسایشی وڵاتانی تووشی کێشە و گرفت کردووە. کێشەی بەردەوامی مادده هۆشبەرەکان، بووەتە خەمی هاوبەشی ئینسانەکان و هەڕەشەیەکی نێونەتەوەیی کە هەڕەشە لە سەلامەتی جەستەو ئەخلاقی ئینسانەکان دەکا و بە مەترسییەکی ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ مرۆڤ لە قەڵەم دەدرێ. کێشانی مادده هۆشبەرەکان بە شێوەی بەردەوام، گیرۆدەیی جەستەیی و دەروونی دروست دەکات. سەرەتا زیان بە بنەماکان دەگەیەنێ و لە ڕێ

بەدەریان دەکا و پاشان کۆمەڵگا و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دەخاتە مەترسییەوە و کۆمەڵگای گیرۆدەبوو لە هەر وڵاتێکدا هێزێکی سەربار و بەرخۆرە. جگە لەوە کێشان و قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان زیان بە ئابووری وڵاتان و ئابووری نێونەتەوەیی دەگەیەنێ.

## پەیماننامەکان و هاوکارییە نێونەتەوەییەکان لە دژی ماددە هۆشبەرەکان

پەیماننامە نێونەتەوەییەکانی ماددە هۆشبەرەکان، بەرهەمی ئەو هاوکارییە نێونەتەوەییانەیە کە لە ساڵی 1909 تا 1988دا ئەنجام دراون. ئەم پەیماننامانە بریتین لەو ڕێکخراو و دامەزراوە نێونەتەوەییانەی کۆنترۆڵکردن و بەرپرسی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان و بنەمای هاوکاری نێونەتەوەیین دژی ماددە هۆشبەرەکان و بەردەوامبوون لە سەر ئەم ڕێگایە دەتوانێ هەنگاوێکی کاریگەر بێ بۆ ڕاگیرکردنی ئەم دیاردەیە لە جیهاندا. لە پەیماننامەکاندا، جەخت لە سەر پێویستی کاری هاوبەش لە ئاستی جیهان بۆ دژایەتیکردنی ماددە هۆشبەرەکان و هاوکاری نێونەتەوەیی لەسەر بنەمای کۆمەڵێك پرنسیپ و ئامانجی هاوبەش بۆ ڕیشەکێشکردنی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان و هاوکاری جیهانی بۆ بەسزاگەیاندنی تاوانباران کراوە.

پێویستە وڵاتان لە مەسەلەی دادوەریکردن، گواستنەوەی دادگاییەکان و چاودێریکردنی دۆسیەکاندا یارمەتی یەکتر بدەن تا سەرکەوتن لە خەباتی جیهانی دژی ماددە هۆشبەرەکان وەدی بێت. لە بەرئەمە لە ماددەی 7ی پەیماننامەی پەسەندکراوی ساڵی 1988دا داوا لە لایەنە بەڵێندەرەکان کراوە کە هاریکاری نزیکی یەکتر بکەن و بۆ خەبات دژی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان و دەرمانە سڕخۆشکەرەکان یارمەتی یەکتر بدەن.

دانــەوەی تاوانبــاران، لــە پەیماننامــەی پەســەندکراوی 1981ی مــاددە هۆشبەرەکاندا، چەمکێکی روونە کە ماددەی 6ی ئەو پەیماننامەیە لـە 12 بڕگەدا هەلومەرج و چۆنێتی دانەوەی تاوانباران باس کراوە. جێبـەجێبوونی ناوەرۆکی پەیماننامەکە لـە پەیوەنـدی لەگـەڵ دانـەوەی تاوانبـاران کـە لـە پەیوەندییە یاسـایی و سیاسـییەکانی نێـوان وڵاتانـدا مەسـەلەیەکی بـاس هەڵگرە. سـەرباری ئـەوەی کـە پەیماننامەکـە بـە روونـی باسـی کـردووە، دەوڵەتەکان بە شـێوەی جیـاواز لێـك دەدەنـەوە و بارمەتیـدانی قـەزایی و دانەوەی تاوانباران کەوتۆتە ژێر کارتێکەری پەیوەنـدی و رەفتـاری سیاسـی وڵاتـــان لەگـــەڵ یـــەکتردا. لەپەیماننامـــەکانی 1961و1971 دا دانـــەوەی تاوانباران هیچ گرەنتییەکی نییەو لە ئامۆژگاری و پێـشنیار بـۆ دەوڵـەتان واوەتــر نەچــووە. ئــەم مەســـەلەیە لــە پەیماننامـــەی 1988دا لەلایـــەن ئیمزاکەرانەوە سەرنجی وردی پێدراوە، بەڵام لە کردەوەدا جیاوازی بیروبۆچون لـە نـاو دەوڵەتانـدا هەیـە کـە بووەتـە هـۆی جێبەجێنـەبوونی نـاوەرۆکی پەیماننامەکــەی لەمــەڕ دانــەوەی تاوانبــاران. یاســای دراوی ســاختەی نێونەتەوەیی یەکێك لە بەرچاوترین هەوڵەکانە لە پێناو خەبات دژی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکاندا. ماددەی 3ی پەیماننامەی پەسەندکراوی 1988 لایەنە بەڵێندەرەکان و دەوڵەتانی ئەندامی ناچار کردووە کە ئەو دراوە ســاختەیەی کە بەرهەمی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکانە، لە یاسا پەیوەستەکانی خۆیاندا بە تاوان لە قەڵەم بدەن. دروستکردنی دراوی ساختە، پرۆسەیەکە کـە تێیـدا ساختەکار سەرچاوە و داهاتە نایاساییەکان دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی یاسایی.

دە ســاڵ دوای پەیماننامـــەی 1988، واتـــە لـــە ســـاڵی 1988دا لـــە کۆبوونەوەکانی تایبەتی کۆڕی گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بـە ئیمزای 185 وڵات راگەیەندراوی سیاسی پەسەندکرا کە لە رەشنووسـەکەیدا داوا لە وڵاتان کراوە کە ئەو پارە ساختەیەی کە لە ئەنجامی قاچاخی مـاددە

هۆشبەرەکان و تاوانەکانی دیکەی پەیوەندیدار بەدەست دێن و هەروەها ئەو قازانجە ماددییانەی کە وڵاتان لەم پەیوەندییەدا چنگیان دەکەوێ، مەحکووم و ریسوا بکەن و بۆ جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی پەیماننامەکەی 1988 لە بواری خەبات دژی دروستکردنی پارەی ساختە، چەند پرنسیپێکی پێشنیار کردووە. ئامادەکردنی چوارچێوەیەکی یاسایی گشتگیر، ناسینی تەواوی باندەکان، دۆزینەوە و دەستبەسەراگرتنی ئەو دەسکەوتانەی بە هۆی تاوانەوە وەچنگ کەوتوون، ئامادەکردنی سیستمێکی یاسایی- دارایی کاریگەر لە پێناو بەرگریکردن لە دەستڕاگەیشتنی تاوانباران و ...هتد، بەشێکن لەو پرنسیپانەی لەم ڕاگەیەندراوەدا پێشنیار کراون.

## میکانیزمەکانی بەرگریکردن لە ئاستی نێونەتەوەییدا

وەگەڕکەوتنی سەرمایە و قازانجی زۆر و زەوەندی قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان کە لە نێوان 400 تا 600 ملیارد دۆلاردا مەزەندەکراوە، هۆکارێکە کە ئەم دیاردەیەی کردۆتە شتێکی دڵخۆشکەر بۆ هەندێ لە سیاسەتمەدارەکان و دەوڵەتەکان و بۆتە هۆی ئەوەی کە باندەکان، گرووپە سیستماتییەکان و قاچاخچییەکان هەست بە ئاسایش بکەن، لە ئاستی نێونەتەوەییدا بوارەکە بە گونجاو بزانن و بە بەشداریکردنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی هەندێ لە دەوڵەتان و دەستڕۆیشتوویی لە نێو حکومەتەکاندا دەست بکەن بە بازرگانیکردنی ماددە هۆشبەرەکان.

کێشەی جیهانی ماددە هۆشبەرەکان لە ئاستی نێونەتەوەیدا پێویستی بە میکانیزمی پێشگیرانە هەیە تا پێش بە بەقەیرانبوونی ئەم دیاردەیە بگرن.

ئەم میکانیزمانە بریتین لە:

## أ- کۆنترۆڵکردن و کەمکردنەوەی ویستە و دەرخستەی کێشانی ماددە هۆشبەرەکان

### 1. هۆکارەکانی چوونەسەری ویستە و دەرخستە

1-1. ناهاوسەنگی لە نێوان کەمکردنەوەی داخوازی و دژایەتیکردنی دەرخستن لە ئاستی نەتەوەیی (نیشتمانی)دا.

1-2. دژایەتیکردنی بە زەبروزەنگ بە پشتبەستن بە هێزە ئەمنی و سەربازییەکان.

1-3. دووردەستبوونی سەرچاوەی سەرەکی بەرهەمهێنان و قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان.

1-4. پشتگوێخستنی لایەنە جیاوازەکانی ئەم دیاردەیە لە کاتی داڕشتنی ستراتیژی ڕووبەڕووبوونەوەدا.

1-5. تەحریمکردن و قەدەغەکردنی ماددە هۆشبەرەکان.

1-6. ناکۆکی نێوان یاساکانی خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا.

1-7. دەستێوەردانی سیاسەت لە یاسا نێونەتەوەییەکاندا و بایەخنەدانی دەوڵەتەکان و بەسیاسیکردنی مەسەلەی ماددە هۆشبەرەکان.

1-8. خەباتی بێ بەرنامە و ناهەماهەنگ لە دژی چاندن، بەرهەمهێنان، بڵاوکردنەوە و قاچاخی ماددە هۆشبەرەکاندا.

1-9. کێشەکانی کۆمەڵگە، لە ڕووی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەوە.

1-10. دڵخوازبوونی ڕێژەیی، هێورکەرەوە و ئارامبەخشبوون و لایەنە دەرمانییەکانی ماددە هۆشبەرەکان.

1-11. بەربڵاوی قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان و هەوڵی قاچاخچییەکان.

12-1. گرووپی گیرۆدەکـان (گیرۆدەبوونـەکان) لـە ئاسـتی نێونەتەوەییـدا، هۆکاری چوونەسەری ویستە و دەرخستەن.

## 2. هۆکارەکانی کەمبوونەوەی ویستە و دەرخستە

کەمبوونەوە و کۆنترۆلکردنی هۆکارەکانی چوونەسەری ویستە و دەرخستە و سەرنجدان بەو 12 هۆکارەی سەرەوە، جێبەجێکردنی بەرنامە ئامانجدار و پێشگیرانەکان لە لایەن دامەزراوە کەلتووری، کۆمەلأیەتییەکان، میدیا و بلأوکراوەکان و پێکهێنانی هێزی هاندەر و هیوابەخش، پڕکردنەوەی کاتەکانی بێکاری لاوان بە شێوەی پەروەردە و فێرکردنی بنەماڵەکان و کۆمەڵگە و دروستکردنی پەیوەندییەکی لۆژیکی بۆ پێشگیریکردن و کەمکردنەوەی داخوازی لە چوارچێوەی ستراتیژێکی هاوئاهەنگدا دەتوانێ ببێتە هۆی کەمبوونەوەی داخوازی و کۆنترۆلکردنی دەرخستەی ماددە هۆشبەرەکان.

بۆ دانانی ستراتیژی لە خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکاندا، پێویستە هۆکارە سەرەکی و لاوەکییەکانی چوونەسەری داخوازی بناسرێن و کەمبوونەوەی ویستە و دەرخستە لە رووبەرووبوونەوەیەکی ریشەییانەدا هاوسەنگ بکرێن. پێویستە هەنگاوەکانی پێشگیریکردن لە پرۆسەیەکدا جێبەجێبکرێن و وەك پێویستیەکی کۆمەلأیەتی و کەلتووری بایەخی تایبەتیان پێ بدرێ.

### بەرگری لە سەرتاسەری جیهاندا

یەکێك لە هۆیەکانی راکێشرانی وەرزێرەکان بەرەو لای بەرهەمهێنانی خەشخاش، کۆکا و شادانە پڕقازانجبوون و نرخی بەرزی بەرهەمەکانی ماددە هۆشبەرەکان و داهاتی ئابووری و سازگاربوونی ئاووهەوایە. یەکێك لە رێگا

پێشنیارکراوەکان بۆ کەمکردنەوەی دەرخستەی مادده هۆشبەرەکان، جێگرتنەوەی بەروبوومی رێپێدراوە. ئەم کارە پێویستی بە ئیرادەیەکی نەتەوەیی، بەرنامەی نیشتمانی و هاوئاهەنگ، یارمەتی نێونەتەوەیی، تەرخانکردنی ئامێر و کەرەسەی کشتوکاڵی و ئامادەکردنی دەوڵەتەکان لە پێناو گۆڕینی مۆدێلی چاندندا هەیە. چاندنی کاکاو ، قاوە، ئاناناس و کاوچۆ وەك جێگرەوە پێشنیار کراوە.

## ج: کۆنترۆڵکردنی سنوورەکان و گومرگەکان

قاچاخ و ترانزیتی مادده هۆشبەرەکان پەیوەندی راستەوخۆی لە گەڵ سنوورە خاکی، ئاوی و هەواییەکاندا هەیە. قاچاخچییەکان جگە لە گواستنەوە و گەیاندنی مادده هۆشبەرەکان لە رێگای سنوورە نافەرمییەکانەوە، وازیان لە سنوورە فەرمییەکانیش نەهێناوە، بەڵکو بە شێوەی جۆراوجۆر مادده هۆشبەرەکان قاچاخ دەکەن‌و بارە قاچاخەکان ئاودیو دەکەن.

کۆنترۆڵکردنی سنوورەکان پێویستی بە بەرنامەی نەتەوەیی و هاوکاری نێونەتەوەیی هەیە. بەستنی سنوورەکان لە رێگای لەمپەرە جۆراوجۆرەکانەوە، زیادکردنی بارەگاکانی سەرسنوور و بەهێزکردنی گومرگەکان بە هۆی ئامێر و کەرەسەی ئەلەکترۆنی و پێشکەوتوو، هۆکارێکی گرنگن بۆ کۆنترۆڵکردن و کەمکردنەوەی قاچاخی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان و دامەزراندنی دەرخستە و کۆنترۆڵکردنی داخوازی بۆ مادده هۆشبەرەکان.

## دەرئەنجام

لە پەیماننامەی شانگهای چینیەوە وەك یەکەمین هەنگاوی نێونەتەوەیی دژی ماددە هۆشبەرەکان لە ساڵی 1909 تاکو ئەمڕۆ 94 ساڵە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی دژی کێشان و قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان هاوکاری یەکتر دەکات. ڕەوتی گۆڕین و باشترکردنی ئەو هەنگاوانەی لە پێناو کۆنترۆڵکردن و کەمکردنەوەی کێشان و قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان هەڵگیراون، پەسەندکردنی پەیماننامەکان، دامەزراندنی دەزگا سەرەکی و لاوەکییەکانی کۆنترۆڵکردنی ماددە هۆشبەرەکان لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا و هاوکاریکردنی وڵاتان لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا و بەرنامە نەتەوەییەکان بۆ خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان، تێکڕا باس لەو ڕاستیە دەکەن کە دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان پەتایەکە بۆ هەموو خەڵکی جیهان و تێکڕای وڵاتان سەرباری ئەوەی لە ڕووی کەلتووری، ئایینی، کۆمەڵایەتی و قەوارەی سیاسی و حکومەتییەوە جیاوازن، دەستە و یەخەی ئەم کێشەیەن.

ئامار و زانیارییە بڵاوکراوەکان باس لەو شتە گرنگە دەکەن کە پەیماننامە نێونەتەوەییەکان، هەوڵ و هەنگاوە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەم دیاردەیە و کەمکردنەوەی پەخشکردن و داخوازی بۆ کێشانی ماددە هۆشبەرەکان، بەگوێرەی پێویست نەبووە و خەبات دژی کێشان و قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان لە چوارچێوەی جوگرافیایی وڵاتان و تێپەڕ چووە پەرژ و بڵاوەکانیش نەیتوانیوە پێش بە گەورەبوونەوەی ئەم دیاردەیە بگرێ.

له دەمی ئێستادا، بازرگانیکردن بە ماددە هۆشبەرەکان، وەك پرۆسەیەکی لێهاتووە کە ڕێکخراوەکان، کارتێلەکان، گرووپە سیستماتییەکان و باندە تاوانکار و مافیاییەکان قازانجی لێدەخۆن و بەرژەوەندی وڵاتانی بەرهەمهێنەر، وڵاتانی ترانزیت (سەر ڕێگای قاچاخکردن)، دەسەڵاتە گەورەکان و قاچاخچییە نێونەتەوەییەکانی پێکەوە بەستووە و بۆتە یەکێك لە پڕقازانجترین مامەڵە نێونەتەوەییەکان و دیارە بەردەوامبوونی بەستراوەتەوە بە داخوازی بۆ کێشان. سەرباری هەوڵەکان و وەرچەرخانە دڵخۆشکەرەکان، دیسانەوە نیگەرانییەکان نەبڕاونەتەوە. بازرگانی پڕقازانجی ماددە هۆشبەرەکان بە شێوەی قاچاخکردن و ترانزیت هەر بەردەوامە و دەوڵەتەکان پارەیەکی زۆر دەکەنە خەرجی کەمکردنەوەی پەخشی ماددە هۆشبەرەکان. توندوتۆڵ نەبوونی سنوورەکان، پێویستی سیاسی و ئابووری هەندێ لە دەوڵەتەکان بە داهاتی ماددە هۆشبەرەکان، هاتنە ناوەوەی ڕێکخراوەکان، کارتێلەکان و قاچاخچییە نێونەتەوەییەکان بۆ نێو بواری ماددە هۆشبەرەکان، پەرەسەندنی تاوانی تایبەت بە قاچاخی ماددە هۆشبەرەکان بۆ وێنە قاچاخی چەك و تەقەمەنی، ئینسان رفێنی، دزی و جەردەیکردنی چەکدارانە، قۆڵبڕین لە ئاستی نێونەتەوەییدا و گەشەکردنی تاوانی سیستماتی، هەڕەشە لە کۆمەڵگەی جیهانی دەکات و دیاردەی قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان چۆتە ریزی قەیرانەکانی ژینگە، هەژاری و چەکی ناوکییەوە. هەر ئەمەشە کە بەرنامەی نێونەتەوەیی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی ماددە هۆشبەرەکان ((UNDCP بەم ئاکامە گەیشتووە کە دەبێ لە ئاستی جیهانیدا دژی ماددە هۆشبەرەکان خەبات بکرێ و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان هەوڵ دەدات ئەو وڵاتانەی کە لەسەر ڕێگای تێپەڕینی کاروانەکانی ماددە هۆشبەرەکاندان، پڕ چەك بکات. دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان بە شێوەیەك کە هیچ وڵاتێك بە تەنیا

ناتوانێ لەم شەڕە شاراوەیەدا سەربکەوێ و دەبێت ئیرادەی بە هێزی نێونەتەوەیی لە ئارادا هەبێ و هاوکاری دەوڵەتەکان بکرێ بە شێوەی بنچینەی سیاسەتی خەبات دژی مادده هۆشبەرەکان پەیڕەو بکرێ. پێداچوونەوە بە سەر پەیماننامە نێونەتەوەیەکاندا، ناچارکردنی وڵاتان بۆ پەیوەستبوون بە پەیماننامەکان و تەحریمکردنی وڵاتە پێشێلکارەکان، هاوکاری وڵاتان و رێکخراوە نێونەتەوەیەکان لە رووی یاسایی و قەزاییەوە. تۆمارکردنی تاوانی قاچاخکردنی مادده هۆشبەرەکان وەك تاوانێکی نێونەتەوەیی و دیاریکردنی ستراتیژییەك بۆ کاری هەماهەنگ و هاوسەنگ لە پێناو کۆنترۆڵکردن و کەمکردنەوەی پەخش و داخوازی بۆ کێشانی مادده هۆشبەرەکان، تێکرا ستراتیژی رووبەروبوونەوەن لە گەڵ کێشەی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکاندا. تەحریمکردن و زەبروزەنگ نواندن لەگەڵ دیاردەی مادده هۆشبەرەکاندا نەك هەر نەیتوانیوە پێش بە رەوتی روو لە گەشەی کێشان و قاچاخی نێونەتەوەیی مادده هۆشبەرەکان بگرێ، بەڵکو تاوان و زەرەر و زیانی کەسی و کۆمەڵایەتی و نەخۆشی وەك ئایدز، هیپاتیت و بەفیڕۆچوونی سەرچاوە ماددی و مرۆییەکانی لێ کەوتۆتەوە. رەوشەکە وای لێهاتووە کە ریشەکێشکردن و سڕینەوەی (گیرۆدەبوون) و کێشانی مادده هۆشبەرەکان وەك ئایدیالێکی لێهاتووە.

بە مەبەستی کەمکردنەوەی داخوازی بۆ کێشانی مادده هۆشبەرەکان و دەرمانە سەرخۆشکەرە نایاساییەکان پێویستە لە ئاستی نەتەوەییدا بەرنامەیەکی بەربڵاوی سیاسی، کەلتوری، کۆمەڵایەتی و تەندروستی جۆراوجۆر بۆ رێگەگرتن لە کێشانی مادده هۆشبەرەکان، تاکەکان و بنەماڵەکان لەخۆ بگرێ تا بەم شێوەیە بکرێ دژ بەم دیاردەیە و ئاکامە نەخوازراوەکانی لە نێوکۆمەڵگەدا خەبات بکرێ.

گۆڕینی مۆدێلی بەرهەمهێنان و چاندنی بەروبومی ڕێگەپێدراوی وەك کاکاو، ئەناناس، قاوە و کاوچۆ لە جیاتی چاندنی خشخاش، گرەنتیکردنی نرخ و کڕینەوەی بەروبوومی نوێ، دانی یارمەتی مالّی بەو دەولّەت و وەرزێرانەی کە ئابووری و گوزەرانیان لە ڕێگای بەرهەمهێنانی خشخاشەوە دابین دەکرێ، میتۆدێکی سەرەکی و پێویستە بۆ کۆنترۆلکردن و کەمکردنەوەی پەخشی ماددە هۆشبەرەکان لە جیهاندا. جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە لە ناوچەی کەوانەی زێڕین و بە تایبەت لە ئەفغانستاندا کە لە سالّدا زیاتر لە 4000 تەن تلیاك بەرهەم دەهێنێ، دەتوانێ ببێتە وەرچەرخانێکی گرنگ لە یەك سەدە خەبات دژی ماددە هۆشبەرەکان و هەنگاوێکی کارا و بەپەلە بێت بۆ ڕزگارکردنی ملیۆنان مرۆڤ لە سەرانسەری جیهاندا.

بە چاو خشاندنێك بەسەر ڕەوتی گۆڕانکارییەکان و هەنگاوە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان، هاتنە ناوەوەی دەسەلاّت، سیاسەت و ئابووری بۆ بواری ماددە هۆشبەرەکان، لایەنی دەرمانی و دابەشکردنی ماددەهۆشبەری ڕێگەپێدراو...هتد، دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە سیاسەتی جیهانی، لە پێناو سڕینەوەی دیاردەی قاچاخی نێونەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکاندا کار ناکات و خەبات دژی ئەم دیاردەیە لە ئاستی جیهانیدا و لە هەندێ لە ولاّتاندا، پارادۆکسی کرۆك و ڕوالّەتەکەی یەك ناگرنەوە. لە ڕوالّەتدا ئەم خەباتە، خەباتێکی ڕێکخراوەیی، خاوەن بەرنامە، پرنسیپ و ڕێسایەکە کە هەوێنی هەولّە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکانە، کەچی کرۆکی ئەم خەباتە دەسەلاّت، سیاسەت و ئابوورییە کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە خزمەتی بەرژەوەندی دەسەلاّتدارانە. کۆماری ئیسلامی ئێران لە بەرنەوەی یەکەم ولاّتە کە کەوتۆتە سەر ڕێگای ترانزیت و دەستەو یەخەی ئەم دیاردەیەیە و کەوتۆتە نێو گەمەیەکی پڕ مەترسییەوە، لە هەموو ولاّتە بەرهەمهێنەر و

کرپارەکاندا زیاتر لە رووی هێزی مرۆیی و ماددییەوە خەساری پێگەیشتوە، کەواتــە پێویـستە کــە بەرنامـــەی خــەبات دژی مـــاددە هۆشــبەرەکان و دەرەنجامەکانی خوێندنەوەیەکی تازەی بۆ بکـرێ و تـاوتوێ بکرێتــەوە. بــۆ وێنە یەکێك لە هۆکارەکانی پەرەسەندن و کێشانی مـاددە هۆشـبەرەکان و گیرۆدەبوون لە کۆمەڵگەدا، دژایەتیکردنی ترانزیتی ئەم ماددەیە. ملیۆنەها گیرۆدەبوو لە جیهاندا پێویستیان بـە مـاددە هۆشـبەرەکان هەیـەو 79٪ی تلیاکی جیهان لە ئەفغانستاندا بەرهەم دەهێنـرێ و بـە هـۆی قاچاخـچییە نێونەتەوەییەکانەوە لە رێگـای سـنوورەکانی رۆژهــەڵاتی ئێرانــەوە دەگاتــە ئەوروپا و ئەمریکا. لە ئاستی نەتەوەیـیدا و بـۆ رزگـارکردنی کۆمەڵگــەی ئێرانی لە دەست بەڵای گیرۆدەبـوون و کێـشەی مـاددە هۆشـبەرەکان و بــە ئامانجی کۆنترۆڵکردن و کەمکردنەوەی پەخش و داخوازی بۆ کێشانی ماددە هۆشبەرەکان، وێڕای بایەخدانی جددی بـە سـنوورە رۆژهەڵاتیـەکانی وڵات، پێکهاتەی دانیشتوان، باری کەلتووری، کۆمەڵایەتی، باری ژیان و گـوزەران و نابووری خـەڵکی ئـەو ناوچـانە، دژایـەتیکردنی ترانزیـت لـە بەرنامـەی نەتەوەیی ماددە هۆشبەرەکان وەلا بنرێ و ستراتیژی خۆپاراستن لە بەرامبەر قەدەغـەکردن لـە لایەنـە جۆراوجۆرەکانــەوە، وەك سیاســەتی بنـچینەیی و گشتی جەختی لە سەر بکرێت.